«پێشکێش بە گیانی شەهیدانی

کۆرەوی ۱۹۹۱ی خواروی کوردستان»

پێناسی کتێب :
ناوی کتێب : سەفەر بۆ کوردستان
نووسەر: کەریمی حسامی
مۆنتاژ: ناسری ئیبراهیمی
چاپی یەکەم - ڕێبەندانی۱۹۹٤ستۆکهولم

# پێرەست

# با بچینەوە کوردستان.

وشەیەکی جوان و ئاواتێکی پیرۆزە. بە تایبەت بۆ کەسێک کە ٤٠ - ٥٠ ساڵ تەمەنی خۆی لە پێناو ئازادی نیشتمان وخێر و خۆشی زەحمەتکێشان و نەهێشتنی زوڵم و چەوسانەوەدا برد بێتە سەر. لە ئەنجامی خەبات و تێکۆشاندا، بە ناچاری دەر بەدەر کرا بێ و لە گەل و نیشتمان دوور خرابێتەوە، هیچ شتێک لە گەرانەوە بۆ وڵات و دیتنی چیاو کەژ و مەزرای رەنگین و کانیاو ورووباری سازگار و لە دیداری دۆست و برادەری دڵسۆز و یاری وەفادارو میللەتی فیدا کار خۆشتر و بە تام و چێژ تر نیە. لە هەمووی خۆشتر و دڵرفێنتر ئەوەیە، کاتێ تۆ ئاوارە کرابی، نیشتمانەکەت ژێر دەست و داگیر کراو بووبێ و کرا بێتە مەیدانی راو راوێنی لەشکری دوژمنان و شارو گوندو ئاوایی وێران کرا بن و رەز و باخات و لێرەواری سوتێنرا بن و بە بەر چاوی دەوڵەتانی ( دێموکرات و لایەنگرانی مافی مرۆڤ و کۆمەڵی دەوڵەتە یەکگرتوەکانەوە ) بە گازی کیمیایی بۆمباران کرابێ، بەلاّم ئێستا لە شوێنەواری دەسەلاّتی دوژمنی دڵرەش و خوێنرێژ پاک کرا بێتەوە و ئازاد کرا بێ. دەسەلاّت کەوتبێتە دەست نەتەوەکەت و بە سەر چارە نووسی خۆیدا زاڵ بوو بێت، گەرانەوە بۆ کوردستانێکی ئاوا، ئەگەر بە سەردان و بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ، رەنگە لە پیرۆزی

و خۆشیدا لە زیارەتی مەککەی موکەرەم و مەدینەی مونەوەرە نەمێنێتەوە.

وەک دەزانین دوای راپەرینە مێژووییەکەی نەتەوەکەمان لە خوارووی کوردستان و رامالینی دەسەلاتی شوم و خویناوی بەعس، بەرەی کوردستانی کە زۆربەی جەماوەری تێکۆشەری کوردستانی لە ریزی خۆیدا کۆ کرد بۆوە، وەک تاکە هێزی تێکۆشەر و یەکگرتوو کونترۆلی رووداوەکانی گرتە دەست و بە لێهاتوویی گەیاندیە هەلبژاردنی پارلمان و پێکهێنانی حکومەتی کوردستان و راگەیاندنی سیستمی فیدرالی بۆ کوردستانی عیراق.

لەم بوارە دا لە سەر رووداوەکانی دوای راپەرینی قارەمانانەی خەلک زۆر شت نووسراوە و بۆ چوون و بیرو رای جۆر بە جۆر هاتوونە سەر لاپەری رۆژنامەکان. لەم کورتە نووسراوەیەدا، تەنیا دەمەوێ بە شێوەی یاد داشتی رۆژانە باسی سەفەری خۆم بکەم بۆ کوردستان و لە پەناشەوە ئەگەر پێنووسەکەم لە توانای دا بوو، چ قەیدی نیە سەری نوکی بۆ شیکردنەوە و روونکردنەوەی هێندێ دیاردەو رووداوە لار کاتەوە. لام وایە چی تێدا نیە ئەگەر قەلەمێکی دلسۆز، بە مەبەستی نیشتمانپەروەری و راستکردنەوەی ناتەواویە کان چەند خەتۆتێکی رەخنەو پێشنیار و بۆ چوون لە نووسینەکەی زیاد بکاو چەند خوێنەرێکی کوردیش بیخۆێننەوە.

خۆ چاوە روانی ئەوەش ناکرێ کە نوسراوەیەک بە دلی هەموو کەس بێ. نووسەر نابێ لە وەش بترسێ کە پاشملە هێندێ خەلکی بێکار رەخنەی لێ دەگرن و سەری خۆیاتی بە قسەو قسەلۆکان پێ گەرم دادێنن. من هیچ نرخێک بۆ بەیت و باوی پاشملە و قسەی

هەوایی دانانێم.

شاعیری بە ناوبانگی داغستانی ( ڕەسوڵ هەمزە تۆڤ )دەڵێ : « هەر کەس کتێبێک بخوێنێتەوە عەیبێکی لێ دەگرێ. چ قەیدی یە. نەک هەر کتێبی من، بەڵکوو وەک ئەو پەندە کە دەگوترێ :(کچە مەلاش بێ عەیب نابن»

ئەم کورتە نووسراوەی من بە کتێب حیسێب ناکرێ. کتێب نیە. سەفەرێکم کردوە، سەفەرێکی خۆش بوە و دەمەوێ باسی بکەم. نازانم دەگاتە دەستی چەند کەس و چەند کەس دەیخوێننەوە و بە دڵی چەند کەس دەبێ. گرنگ نیە . گرنگ ئەوەیە بتوانم باسی سەفەرەکەم بکەم و بیهێنمە سەر کاغەز. چونکە باسی کوردستانە. باسی کوردستانێکی لە چنگ دوژمنێکی درندەو خوێن خۆر ئازاد کراوە. باسی نیشتمانێکی بریندار و زەجر لێکراو و خۆ ڕاگر و خاوەن مێژوو سەر بردەو کارە ساتە. دوو کەسیش بیخوێننەوە بەسە. باسکردنی سەفەرێکی ئەو تۆ بێ تام نیە. هەموو کەس لە توانای دا نیە سەفەر بکا. ئەوانەی سەفەریش دەکەن ناپرژێنە سەر نووسینەوەی باسی سەفەرەکەیان و ڕوونکردنەوەی بارو دۆخی کوردستان . لە کوردەواریدا بە داخەوە کەمتر سەرنجی ئەم وردە کارانە دراوە. نووسینەوە نەبۆتە باو. لە کاتێکا ئەم جۆرە نووسینانە ئەگەر کەمیش بن، ئەگەر مەسەلەی گرنگ و قەبەشیان تێدا باس نەکرێ، دیسان لە بواری ڕوشنبیری و کولتور و نەریتی کوردە واریدا شوێنیان دیار دەبێ و لە وانەیە لە دوارۆژ دا، لە کتێبخانەی کوردیدا کەلێنێک پڕ کەنەوە. ئەو سەفەر نامانەی ئێستا ئێمە بە دوایاندا دەگەڕێین کە بیانخوێنینەوە و ڕەنگە کەلکیشیان لێ وەر بگرین، هەر ئەم جۆرە نوسینانەن. تەنیا ئەوەندەیە

چونکە بێگانە نووسیویانە، پێمان وایە ...... فیلیان شکاندوە.
نووسەرێک ناتوانێ بە تەنیا هەموو شت بنووسێ و باسی هەموو رووداوێک بکات، بەلاّم بە هەموان دەتوانن باسی پرانی هەموو شت بکەن. ئەم نووسراوەی منیش باسی بەشێکی سەفەر و کورتەی روو داوەکانە و تا رادەیەک خوێنەری بەرێز لە بارو دۆخی ئێستای کوردستان ئاگادار دەکات.

## هاندان بۆ سەر دانی کوردستان.

دوای راپەرینی قارەمانانەی خەڵک و راماڵینی دەسەلاّتی شومی بەعس لە خوارووی کوردستان، هاو نیشتمانانی ئەم بەشەی کوردستان دەستیان کرد بە هاتو چۆ و سەردانی ولاّت. زۆریان دەچوونەوە کوردستان و دەگەرانەوە. هەر کەسەش بە گوێرەی سەلیقەو بۆ چوونی خۆی باسی رووداوەکانی دەکرد.
نازانم بۆ چی، زۆربەی ئەو برادەرانەی لە گەڵ من ناسیاری و ئاشنایەتیان هەبوو کە چاویان بە من دەکەوت دەیانگوت :« ئەوە سەری کوردستان نادەیەوە؟ بە تەما نی بچیەوە کوردستان ؟ هەق وایە سەرێکی ولاّت بدەیەوە.... »
لە کوردستانەوە یەک دوو نامەم پێگەیشتن، دەیاننووسی:« کاتی ئەوەیە سەرێکی ولاّت بدەیەوە . هاتنەوەت بۆ سەردان رەنگە پێویست بێ»
شتەکە تۆزێ قەویتر بوو. برادەرێکی دڵسۆز گوتی :« پاشملە

گلەییت لیٚ دەکەن دەڵێن بە سەر دانیش ناچێتەوە کوردستان.»

برادەرێکی تر لە کوردستان گەڕا بۆوە گوتی : « باسیان دەکردی، دەیانگوت بە سەفەریش نایەتەوە.»

ئەم باسکردن و هاندانە بە هەر مەبەست و نیازێک بیٚ، جێگای سوپاس و پێزانینە. بەڵام کەسیش ئاگای لە دەردی کەس نیە. کەسێکی لە سوید پەنا بەر بیٚ و بۆ ژیان چاو لە دەستی بەشی کۆمەڵایەتی حکومەتی سوید بیٚ، زەحمەتە بتوانیٚ سەفەر بکات. چونکە ئەو ماوەیە کە لە سەفەر دای پارەکەت نادەنیٚ. مەگەر کابرا خۆ بە حیزبێک فیدراسیۆنێک و دەزگایەکی دەوڵەتیەوە هەڵپە سێریٚ و یا وەک هێندیٚ کەس ڕێگای سەفەر و ژیان بدۆزێتەوە.

شتێکی دیکەش هەیە هاو نیشتمانانی ئەم بەشەی کوردستان، هەموو لە وڵات ماڵو حاڵ و خزم و کەسو کاریان هەیە. ئەرکی سەر شانیانە بچنەوە، سەریان بدەن و بە گوێرەی توانا یارمەتیان پیٚ بکەن.. دیارە وەک لێرو لەویٚ باس دەکرا، چوونەوەی زۆر کەسیش نەک هەر خێری نەبوە، بەڵکوو زیانیشی بە دواوە بوە. بۆتە هۆی هاندانی خەڵک بۆ دەر بەدەری و هاتنە دەر لە وڵات. بۆتە هۆی هێندیٚ کردەوەی ناحەز و خۆ هەڵکێشان و کەش و فش و فیشاڵ و تێکدانی میزاجی خەڵک.

چاریش نیە. کۆمەڵی کوردەواری یە. لە نێو دارستانێکی چڕ و سەر سەوز و با سەفادا، چەند دار و لق و پۆپی ویشکو گەندەڵ هەر دەبن و دارستانەکەشیان پیٚ ناحەز و عەیبدار نابیٚ لە سەر یەک چوونەوەی کوردستان و سەردانی خزم و کەس و کار و یارمەتیدانیان، کارێکی باش و هەنگاوێکی پیرۆزە.

له سەرە تای ئازاد بوونی کوردستان بە ئەرکی نیشتمانی خۆم دەزانی کە هیچ نەبیٚ بۆ زیارەتی نیشتمانی ئازاد کراو و بۆ پیرۆز بایی لەم سەر کەوتنە مەزنە سەفەرێکی ولأت بکەم. هەر چەندە لە سەرە تاوە بۆم نەلوا، بەلأم بە نووسین بۆ رۆژنامەکانی ولأت و چاپەمەنی دەرەوەش هاوکاری و پشتیوانی خۆم نیشاندا.

له رێکەوتی ٤ -٧ - ١٩٩٢ لەم وتارەی خوارەوەدا کە بۆ کوردستانی نویٚ - م نارد بوو، هەڵوێستی خۆم سەبارەت بە ئەزموونی خوارووی کوردستان دەر بڕیبوو. بە خۆشیەوە رۆژنامەی کوردستانی نویٚ وتارەکەی بلأو کرد بۆوە، بەلأم چونکە چاپکراوەکەم نەدیوە، بە پێویستی دە زانم لێرەشدا دەقی وتارەکە بلأو کەمەوە:

## قۆناخێکی ناسک و ئەرکی نیشتمانی

خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەکەمان رێگاو رێبازێکی سەخت و دژوار و پڕ لە کەند و کۆسپ و هەڵس و کەوتی خویناوی بڕیوە و گەیوەتە قۆناخێکی ناسک و لە سەر لوتکەی سەر کەوتن و یا هەڵدێران وەستاوە. رەوەندی خەباتی رزگاریخوازی، شەقامێکی خۆشکراو وراستە ریٚ نیە. پڕە لە کوێرە ریٚ و بەردەلأن و خوارە پێچە و هەوراز و نشێو. لەم رەوەندە دا نە فیز و بایی بوون و هەلأو بگری بیٚ پشتیوانە، نە نا هومێدی و دەستەو ئەژنۆ دانیشتن. نا توانن کۆمەلأنی خەڵک بگەیێننە ئاوات و کاروانی خەبات لە قۆناخی سەر

کەوتندا بحەسێننەوە.

قۆناخی ئیمرۆی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ، ئەرکێکی گەلێک قورس و هەر لەو کاتەشدا هاسان دەخاتە سەر شانی یەک یەکی تاکی نەتەوەکەمان. لەم پلەیەو ئا لەم چوار چێوەیەدا، مەسەلەی سەر کەوتنی خەباتی گەلی کورد لە خوارووی کوردستان بۆتە گرنگترین مەسەلەی رۆژ. ناوچە گەری و حیزبچیەتی و خۆ بە خۆیی دەبێ وەلا بنرێ و بە تێکرایی و بە هەموو تواناوە، ئەم نەمامە ئاو بدرێ و خزمەتی بکرێ و بپارێزرێ کە وا لە خوارووی کوردستان بە تێکۆشان و فیداکاری بە شێکی نەتەوەکەمان نێژراوە و خەریکە رەگ و ریشە دادەکوتێ و پێدەگات.

ئەگەر لە باس و ئاخافتن و نووسیندا ، دان بەوە دادەنێین کە کوردستان یەک ولاتەو کورد یەک نەتەوەیە و بە دەستی زۆرداران و بە فیتی کولونیا لیستان دابەشکراوە و لە هەموو مافێکی نەتەوایەتی بێ بەشە، ئەو دەم پێویستە کاتێ لە یەکێ لەم پارچە دابەشکراو وداگیر کراوانەدا، دەرفەتێک دێتە دەست و هەلێک هەلدەکەوێ، ئەرکی نیشتمانی و نەتەوایەتیمان ئەوە دەبێ کە بە هەموو لایەک ئەم هەل و دەرفەتە بقۆزینەوە و نە هێلین لە دەست بچێ و هەول و تەقەلا و تێکۆشان و فیداکاری میللەتەکەمان بە فیرۆیی بروات.

راستە کە ئەرکی هەر یەک لە بەشەکانی کوردستان، شێوەی خەباتی حیزبە سیاسیەکان لە گەلێ یەکتر تا رادەیەک فەرقی هەیە، بەلام بە جێ گەیاندنی ئەم ئەرکە لە هەل و مەرجی ئالۆز و گرێپوچکەی کوردستان و ناوچەدا، ژیری و وریایی و لێکدانەوەی زانستی و سەبری شورشگێری گەرەکە.

لە رۆژگاری ئیمرۆ و لە بارو دۆخی ئیستادا خاڵی سەرەکی خەبات و مەسەلەی کورد، بریتی‌یە لە مە سەلەی خوارووی کوردستان کە بە کوردستانی عیراق ناو دەبریٚ. خوارووی کوردستانە کە مەسەلەی کوردی گەیاندۆتە رادەی نیو نەتەوەیی و هیناویەتە نیو باس و سیاسەتی دەوڵەتە مەزنەکان و سەرنجی کۆر و کۆمەڵانی گەلانی جیهانی بۆ لای خۆ راکیشاوە. ئەوەش وەنەبیٚ تەنیا ئەنجامی شەری خەلیج و شکانی حکومەتی عیراق بیٚ وەک هیندیٚ کەس لیکی دەدە نە وە. بە لای منەوە هۆی بنە رەتی ئەم سەر کەوتنە خەبات و فیداکاری و قوربانیدانی میللەتی کورد خۆیەتی کە هۆکاری دەرەوەش بۆتە یاریدە دەرێک و گەیوەتە ئەم پلەیە.

راستە کە نەتەوەکەمان لە خوارووی کوردستان لە ماوەی چەندین ساڵی رابردوودا کەوتە بەر پەلاماری وەحشیانەی حکومەتی رەفتار فاشیستی عیراق و چەکی کیمیایی و ئەنفالی چەپەڵ و ژینو سیدی دژی میللەتی کورد بە کار هینا، کوردستانی بە جارێک خاپور و وێران کرد و هەزاران کوردی بیٚ تاوانی زیندە بە چاڵ کرد، بەلاٚم لە لایەکی ترەوە خۆ راگری و فیداکاری و چۆک نەدان لە بەرانبەر سامناکترین چەکی دوژمندا، دەوڵەتە گەورەکانی هینا سەر ئەو بریارە کە سالەهای ساڵ بوو حکومەتی عیراقیان بە پارەو چەکی کۆ کوژ تەیار دەکردو تەنانەت لە بە کار هینانی چەکی کیمیاییش چاویان لیٚ دەپۆشی، بە سیاسەتی چەوتی خۆیاندا بچنەوەو پەڵەی رەش و چلکنی بیدەنگی و خۆ گیل کردن لە ئاست جنایەتی حکومەتی عیراق لە شانی خۆیان پاک کەنەوە ودارو لەلەیەک بۆ دەست دریژی و ملهوری سەددام دابنین کە بە لای منەوە هیشتا کەمیان کردوە و ئەم هەنگاوە

قەردبوی تاوانی ئەوان لە ئاست کورد ناکاتەوە.

لە لیکدانەودو هەلسەنگاندنی رەوەندی رووداوەکانی ئیمرۆی کوردستاندا لە تەک فیداکاری و لیقەوماوی و ئاوارەیی خەلکدا، پیویستە سیاسەت و بەرژەوندی زلهیزەکان و حکومەتگەلی ناوچەش بخرینە بەر چاو و شوینی تایبەتی ئەوان لەم رووداوەدا نەخریتە پشت گوێ و بە ژیری و لیٚ زانی مامڵەی لەگەڵ بکریٚ.

ئەودی لەم قۆناخەدا گرنگی بە خەبات و تیکۆشانی نەتەوەکەمان دەدا، هەلبژاردن و دانانی پارلمانی کوردستانە کە لە میژووی خەباتی خویناوی گەلەکەماندا ئەزموونیکی نوێ و بیٚ پیشینەیە. هەلبژاردنی پارلمانی خوارووی کوردستان، نەک هەر سەبارەت بە کار تیکردنی دوا رۆژی خەباتی رزگاریخوازی کورد، بەڵکو لە باری دیموکراسی و پیشوازی جەماوەریشەوە بیٚ وینە بوو.

خەلکیکی لیقەوماوی برسی، گەمارۆ دراوی ئابووری، لە نیشتمانیکی ویرانکراوی کیمیایی لیدراو، بە هەلبژاردنی پارلمان و پاراستنی هیمنایەتی، سەرە رای کەم و کوری و هیندیٚ ناتەواوی و هەردشەی حکومەتی لە گیانەلا دابووی عیراق، توانی هەلدانی سیاسی و ناسناوەی نەتەوەیی خۆی بە ئیسبات بگەیینیٚ و جاریکی دیکەش بە دنیا نیشان بدات کە نەتەوەیەکی لیهاتوە و لیٚ وەشاوەیی بە ریوە بردن و راپەراندنی کارو باری خۆی هەیە. ریبەرانی سیاسی بزووتنەوەی خوارووی کوردستان بە تاقیکردنەوەی خەباتی دریژ خایەن و ئەزموونی هەلەو ناتەواوی رابردوو، لیهاتوویی خۆیان بۆ یەکیتی و دەر باز بوون لە ساوە ساو و چاوە روانی و بیٚ بریاری نیشانداو بە هەنگاوی لیٚ براوانە ریز و هاو دەردی بیرو رای گشتی خەلکی

جیهانیان بۆ لای خەباتی گەلی کورد راکێشا.

هەڵبژاردنی پارلمان لە خوارووی کوردستان، لە باری شێوەی بە رێوە چوون و گرنگی نێوە رۆک و ئامانجی سیاسی یەوە، لە روانگەو بۆ چوونی جۆراو جۆرەوە لە چاپەمەنی هەندەراندا دەنگی داوەتەوە. بەلام ئەوەی بە گشتی لە سەری یەکدەنگن و چاو دێرەکانی نێو نەتەوەیی دانی پێدا دەنێن، پێشوازی گەرمی خەڵک و دیموکراتی بوونی هەڵبژاردنەکەیە کە لە مێژووی بزووتنەوەی کورد و ولاتانی دنیای دواکەوتوو دا، تا ئێستا نە بینراوە.

هەر چەندە بە بۆ چوونی من دانانی ١٨ ساڵ تەمەن بۆ دەنگدانی لاوی کورد زۆر تەواو نیە. ئێمە دەزانین لاوی ١٤- ١٥ ساڵەی کورد بە تاوانی تێکۆشانی سیاسی ئیعدام دەکرێ و لە مەیدانی خەباتیشدا قارەمانەتی دەنوێنێ. یان دیاریکردنی راژەی ٧٪ بۆ گەیشتن بە پارلمان کە مونوپولی بۆ حیزبە گەورەکان دە خولقێنێ، دەبێتە هۆی بەشدار بوونی کەمتری حیزب و گرۆ سیاسیەکانی گۆرە پانی خەبات و کەسانی نیشتمانپەروەری سەر بە خۆ. یان بێ بەشکردنی دەیان هەزار کوردی خوارووی کوردستان لە دەنگدان کە بە شی هەرە زۆریان لە سەر خەبات و تێکۆشان ئاوارە و دەر بەدەر بوون. ئەوانە هێندێ خاڵی سەرەکی کەم و کوری و ناتەواوی یاسا و بەرێوە بردنی هەڵبژاردنی پارلمان بوون.

ئێستا ئەوە نیزیکەی دوو مانگ لە هەڵبژاردنی پارلمان رادەبرێ. بارو دۆخی دژواری کوردستان ئەرکی قورسی خستۆتە سەر شانی پارلمان و بەر پرسانی بزووتنەوە. ئەرکی لە هەموان دژوارتر و هەر لەو کاتەشدا گرنگتر بریتی یە لە چارە سەر کردنی برسیەتی و باری نا

هەمواری ئابووری کە قرزەی لە خەڵک بریوە و لەم بوارە دا هەواڵی دڵتەزێن دە گەنە دەرەوەی وڵات.

ئەگەر عیراق سەبارەت بە هار بوون و رەفتاری فاشیستی سەددام کەوتۆتە بەر گەمارۆی ئابووری، کوردستانی عیراق دوو قات ئابلوقەی ئابووری بە سەردا سەپاوە و خەڵک لە ژیانی سەرە تایی رۆژانە بێ بەشە. کە وابوو چارە سەر کردنی ئەم وەزعە نالە بارە لە هەر رێگایەکەوە بێ، دەبێتە ئەرکی سەر شانی رێبەرانی سیاسی خوارووی کوردستان. لام وایە بە هەڵە ناچین ئەگەر بێژین سەر کەوتنی بزووتنەوەی کوردستانی خواروو کە تەئسیری راستەو خۆی دەبێ بۆ مەسەلەی کورد لە هەموو کوردستانی دابەشکراو، راستەو خۆ بەستراوەتەوە بە چارە سەر کردنی بارو دۆخی ئابووری و کەم کردنەوەی برسیەتی خەڵک و پاراستنی ئاسایش و هێمنایەتی و دیموکراسی لە وڵات دا.

ئەگەر چارە سەر کردنی وەزعی ئابووری گرنگترین مەسەلەی ئیمڕۆی خوارووی کوردستانە؟ ئەگەر چارە سەر کردنی ئەم مەسەلەیە دەبێتە هۆی سەقامگرتوویی دەسەلاتی میللی کورد لەم بەشەی نیشتماندا و دەبێتە هۆی پوچەڵکردنەوەی پلان و نەخشەی دوژمنانی گەلی کورد و پێشکەوتنی مەسەلەی کورد لە جیهاندا؟

ئەگەر کوردستان بە یەک وڵات و کوردیش بە یەک نەتەوە دەزانین و بروامان بەوە هەیە کە ئازادی و رزگاری و سەقامگرتوویی دەسەلاتی میللی لە هەر یەک لە بەشەکانی کوردستان(سەرەرای جیاوازی شێوەی بە رێوە بەری) دەبێتە هۆی بەرەو پێشچوون و گەشە کردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی بەشەکانی تر، ئەو دەم لە سەر

هەموو حیزب و ڕێکخراو وهێزە سیاسیەکانی کورد پێویستە نەک هەر هیچ کۆسپ و تەگەرەیەک نە خەنە سەر ڕێگای پتەو بوون و چارە سەر کردنی مەسەلەی کوردستانی خواروو، بەڵکوو ئەرکی سەر شانیانە بە هەموو تواناو وزەو دەرەتانەوە یارمەتی بە پتەو بوون و بە هێز کردنی دەسەڵاتی ئێستای کوردستانی عیراق بکەن. لە بەر تیشکی ئەزموونی خەباتی رابردوو ئەوەمان لە بیر نەچێ کە شکان و روخانی ئەمجارەی دەسەڵاتی خوارووی کوردستان دەبێتە کارەساتی داخداری نەتەوەیی و نیشتمانی.

نابێتە رەشبینی ئەگەر بێژین بارو دۆخی ژێئو پۆلیتیکی کوردستان و هەل و مەرجی نێو نەتەوەیی و کۆمەڵێک فاکتوری بابەتی و زەینی کەش و هەوایەکی ئەو تۆیان پێک هێناوە کە دەرەتانی راپەرینی گشتی لە کوردستانی گەورە و تێکدانی ئەم سنورە دەستکردانەیان لە کاتی ئێستادا بریوە. بە لاَم نەک هەر دوور نیە، بەڵکوو وەک دەبینین لە وانەیە هەلی ئەو تۆ هەڵکەوێ کە کورد لە یەکێ لە بەشەکانی کوردستان بتوانێ چارە نووسی خۆی بگرێتە دەست. جا لە کاتی ئاوادا پێویستە لە هەموو لاوە، بە هەموو تواناوە، پشتی سەر کەوتنی ئەم هەل و ئامانجە بگرین.

دوژمنانی گەلی کورد هەر چەندی بە روالَەت دم لە دۆستایەتی هێزێکی کوردستانی بدەن، بەلاَم لە ئامانجی ستراتیژی دا بە گشتی نەیاری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردن و بۆ تێکدانی ریزەکانی بزووتنەوە و ئاژاوە نانەوە و ئاخریەکەشی بۆ هێشتنەوەی گەلی کورد لە ژێر دەستی دا، هەزار پیلان و داو دەنێنەوە. کە وابوو کوردیش دەبێ سیاسەتی ژیرانەی خۆی هەبێ و نە کەوێتە داوی دوژمنانەوە.

ئێمە هیوا دارین ڕێبەرانی سیاسی کوردستانی خواروو لە چارە سەر کردنی بارو دۆخی ئابووری و پاراستنی ئاسایشی گشتی و پتەو کردنی دیموکراسی و پوچەڵکردنەوەی پیلانی دوژمنان دا سەر کەوتوو بن و هەموو حیزب و هێز و تاکی کورد و کوردستانیش لە یارمەتیدان و سەر کەوتنی بزوتنەوەی ئیمرۆی کوردستانی خوارووودا بەشداری بکەن. ٤/٧/٩٩٢»

## بریاری سەفەر

ڕاستە من لەم بەشەی نیشتماندا هیچ خزم و کەس و کاری نیزیکم نینە، بەڵام گومانم لەوەدا نیە کە دۆست و برادەری نیزیکتر لە کەس و کارم لە خوارووی کوردستاندا کەم نین. لە باری ڕوشنبیری و نووسین و تێکۆشانی سیاسیشەوە شاراوە نیم. بریارم دا بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ سەفەرێک بکەم و لانی کەم بە زیارەتی نیشتمان و

یە دیداری دۆست و برادەران و بۆ پیرۆز بایی لە هێزە سیاسیەکان، تۆزێ دەردو داخی دەر بەدەری و دووری لە نیشتمان لە سەر دڵم سوک بکەم.

ساڵی ١٩٩٢ لە بەر نە بوونی پاسپۆرت بۆم نەکرا. ساڵی ١٩٩٣ وەرگرتنی ڤیزای تورکیا ٦ مانگی خایاند. دوای وەر گرتنی ڤیزا، چەند ڕۆژ پێش ئەوەی بکەومە ڕێ، لە گەڵ برادەرێکی کارمەندی مەکتەبی حکومەتی کوردستان لە سوید باسی سەفەرم کرد و چۆنیەتی ڕێگاو هاتوو چۆم لێ پرسی. زۆری پێخۆش بوو، گوتی :

« کەی دەرۆی ئێمە بەرقیە دەنێرین بۆ برادەران پێشوازیت بکەن و لە هەولێریش میوانی میوانخانەی یەکێتی دەبی. » لە گەڵ سوپاس لە هەڵوێستی کوردانەی ئەم برادەرە، هیچم نەگوت. لای خۆم دامنا بوو وەک ڕێبوارێکی ئاسایی سەفەر بکەم و قورسایی نەخەمە سەر شانی دۆست و برادەران.

دەمزانی کاک خەلیل بێکەس دەیەوی بچێتەوە کوردستان. تەلیفونم بۆ کرد و گوتم با پێکەوە بڕۆین. زۆری پێ خۆشبوو. بریارماندا رۆژی ١١/١١/٩٩٣ بکەوینە ڕێ. لەو رۆژە دا چووینە فرۆکە خانە. بارو دۆخی سەرووی کوردستان وایکرد بوو ئەو کەسانەی بە هێڵی هەوایی تورکیادا سەفەریان دەکرد، وەهایان دە پشکنین قەت کوێر بۆ دۆزینەوەی ئەسپێ جلەکانی وانادۆزی.

لە کتێب بەدەر چیدیکەم پێ نەبوو. ئەویش بە داخەوە ئەوەندە کەم بوون لانی کەمی تاسەی ئەو دۆست و برادەرانەی نەشکاند کە دەمێکە تامە زرۆی خوێندنەوەی نوسینەکان و بیرەوەریە کانمن.

کە سوار بووین لە نێو فرۆکەدا رۆژنامەی تورکی‌یان هێنان. رۆژنامەی ( جەمهوریەت و میللیەت و گوین ئایدینم وەر گرت. هەوەڵ شتێکی لە لاپەرەی هەر سێک رۆژنامەدا سەرنجی راکێشام، وشەی( p.k.k ) و (ئاپۆ) و (عبدوللە ئوجەلاُن) بوو. دیارە نووسینەکەی ئەوان جگە لە جنێو وبوختان و درۆ ودەلەسەی بێشەرمانە چیتر نەبوو. بەلاُم من پێی گەشامەوە. چۆن ؟ ئەوە رۆژنامەی تورکیان لاپەرەکانیان بە باسی کوردستان و بە ناوی کورد و حیزبێکی کورد و ڕێبەرێکی کورد دەرازێننەوە؟ هەر ئەو رۆژنامانە نەبوون لە وشەی پیرۆزی کوردستان و لە ناوی کورد دەسڵەمینەوە و زەندەقیان دەچوو ؟

وشەی کورد و کوردستان بە سەر زمان و قەڵەمیاندا نەدەهات و نووسینیشی لە رۆژنامەکاندا یاساخ و باسی سەر بوو.

کارم بە وە نیە کە سیاسەتی (p.k.k ) چەندە راستە و چەندە لە گەڵ هەل و مەرجی سیاسەتی ئیمرۆی جیهان دێتەوە. بەڵام راستی ئەوەیە خەباتی شۆرشگێرانەی پارتی کرێکارانی کوردستانە وایکردوە کە تەنانەت کۆرە هەرە شۆڤێنی و رەفتار فاشیستەکانی تورکیاش دان بەوە دابنێن کە کورد لە سەرووی کوردستان راپەریوەو بۆ وەدەست هێنانی مافی رەوای نەتەوایەتی و بۆ رزگاری کوردستان لە بندەستی لە گیان بەختکردن دریخی ناکات.

چ رەگەز پەرستانی تورک و چ دەوڵەتە بە ناو ( دیموکراتەکانی ) لایەنگری تورکیا و چ هێندێ فەریکە سیاسی کورد، بە ترۆریستیان ناو بەرن، هیچ لەم واقعیەتە ناگۆرێ کە پارتی کرێکارانی کوردستان ، وەک هێزی سەرەکی سەرووی کوردستان لە نێو کۆمەلانی بەشخوراوی خەڵکی کورد دا، ریشەو رێز و نفوزی هەیە ، لە لایەن خەڵکەوە پشتیوانی لێ دەکرێ. هەر خەباتی ئەو حیزبەیە کە وا رەگەز پەرستانی تورکیای ناچار کردوە بۆ لە ناو بردنی (واتە لە ناو بردنی کورد ) دەستی پارانەوە بۆ دەوڵەتانی ئوروپا و دراوسێ درێژ بکەن و بۆ پێشێل کردنی مافی مرۆڤی کوردیش داوای پشتیوانی لە حکومەتی ئەمریکا بکەن کە ( پاراستنی مافی مرۆڤی ) کردۆتە بنێشتە خۆشکە و لە چوار چێوەی بەرژەوەندی مونوپولەکانی سەرمایەداریدا دەیسورێنێ و کایەی پێدەکات.

ئێستا کە بە ناچاری بە سەر ئەم باسەدا کەوتم، ناتوانم لە سەر ئەم مەسەلەیەش هەڵویست نەگرم کە داخوا سیاسەتی ئێستای ( p.k.k. )

لە بارو دۆخی ئیمرۆی کوردستان و نەزمی نوێی جیهانیدا، چەندە لە خزمەتی بەرژەوەندی گشتی مەسەلەی کورد دایە ؟ بە بۆ چوونی من هەر کردەوەو هەنگاوێک کە ئیمرۆ زیان بە نەزم و ئەزمون و قەوارە و بەرژەوەندی دامەزراوی خوارووی کوردستان بگەیێنێ، ناتوانێ خزمەت بە پێشەوە چوونی مەسەلەی کورد بکاو دوژمنانی گەلی کورد کەلکی لێ وەر دەگرن. مێژوو لەو کەسانە خۆش نابێ کە ئیمرۆ بە زیانی ئەزمونی تازەی کوردستان و دەسەلاتی نەتەوەیی خوارووی کوردستان بجولێنەوە.

با لەم باسە لادەم و لاپەرەیەکی دیکەی رۆژنامەکانی تورکی هەلدەمەوە. لە لاپەرەی تری رۆژنامەکاندا نووسرا بوو: « دوکتور ئیسماعیل بێشکچی جارێکی تر لە دادگای نیزامی دا بە تاوانی پشتیوانی لە شۆرشی کورد بە سالێک و هەشت مانگ حەپس و چوار میلیون لیرە مەحکوم کراوە. »

وەک دەزانین دوکتور ئیسماعیل بێشکچی بە تاوانی دیفاع لە مافی کورد و پشتیوانی لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد چەند سال لە حەپسێدا ماوەتەوە.حەپس و گوشار و هەرەشەی رەفتار فاشیستەکانی تورک نەیتوانیوە ئەم ئینساندۆستە و ئەم دێموکراتە لە ئامانجی پیرۆزی خۆی بگێرێتەوە.

لە گەل خوێندنەوەی ئەم خەبەرە ،نووسەرو روناکبیرانی ئێرانیم وەبیر هاتەوە. لە تەواوی ماوەی دەسەلاتی شوومی رەزاخان و کورەکەی، لە ماوەی ١٤ سال حکومەتی رەشی ئاخوندی دا، کورد لە ژێر هێرشی دڕندانەو راو نان و کوشتو بر دابوە. یەک نووسەر و زاناو شەخسیەتی نێو بەدەرەوەی ئێرانی نەبوە کە ستەمی نەتەوەیی و

کوشتاری کوردی مەحکوم کرد بیٚ و لە سەر مافی پیٚ شیٚل کراوی کورد وەدەنگ هاتبیٚ.

رەنگە سیاسیە کار کوشتەکانی فارس، بە گویٚرەی کەش و هەوای سیاسی و بۆ فریو دانی فەریکە سیاسی کورد جاروبار باسی کوردیان کرد بیٚ و وتاریٚکیان نووسیبیٚ و پاش ماوەیەک لە گەڵ گۆرانی هەواو بارو دۆخی سیاسی لە وەندەش پاشگەز بووبنەوە. نەک هەر ئەوە بەڵکوو لەوەش قەباحەتتر لەم دواییانەدا سیاسی و نووسەر و دیٚموکرات و کۆنە شاپەرست و راست و چەپی ئیٚرانی، شان بە شانی بۆمباران و کوشتاری حکومەتی ئاخوندی، کەوتوونەتە هیٚرش و پەلاماردانی حیزبی دیٚموکراتی کوردستانی ئیٚران بەو تاوانەی کە بە زمانی سوتاو داوای ( خود موختاری) دەکات. لە کاتیٚکا هیچ مەعلومیش نیە کە گەلی کورد لە رۆژ هەلاتی کوردستان چەندە بەو داوایە رازیە ؟

داوای ( خود موختاری) بۆتە ئامرازو بیانوو بە دەست شۆڤینیستە ئیرانیەکان تا حاشا لە بوونی نەتەوەی کورد و فرە نەتەوەیی ئیٚران بکەن و لەم هیٚرش و پەلامارەدا، تەنانەت شاعیر و تویٚژەریش نایانەویٚ لە حکومەتی ئیسلامی ئیٚران وەدوا بکەون.

ئاغای عەلی میر فطروسی کە بە شاعیرو نووسەر و تویٚژەر و گۆیا بە ( پیٚشکەوتو خوازیش) ناسراوە، لە وتوویٚژیٚکی چاپەمەنیدا نەک هەر ستەمی نەتەوەیی و کوشتاری حکومەتی ئیسلامی لە کوردستان مەحکوم ناکات، بەڵکو لە ژیٚر وشەی قوڵمبە و بیٚ تامی سواو ولە کار کەوتوو، لە بوونی کوردیش وەک (نەتەوە) حاشا دەکات. کاتیٚ رۆژنامە نووس لیٚی دەپرسیٚ:« لە بارەی ئەوەی ئیمرۆ بە ناوی (مافی

نەتەوەکان) و (خود موختاری) و (مافی دیاریکردنی چارە نووس تا سنووری جیا بوونەوە ) لە لایەن هێندێ گرۆی سیاسی دێتە گۆرێ و باسی دەکرێ، بیرورای تۆ چیە ؟»

ئاغای (محقق و شاعیر و نووسەر ) لە وەلام دا دەفەرموێ: «ئێران ولاتێکە ( چەند قەومی ) نەک (چەند نەتەوەیی). قەومە ئێرانیەکان کورد و فارس و بەلوج و گیلەک و تەبەرستانی لە کازیوەی مێژووە لە ژێر یەک‌میچی مێژو و یەک کولتور دا ژیاون. ئێران نەوەک روسیا زیندانی گەلان بوە، نە وەک کاناداو یوگوسلاوی چەند نەتەوەیی بوە. ئەوانەی ئێستا بە هەلگرتنی دروشمی (مافی گەلان و دیاریکردنی چارە نووس تا سنووری جیا بوونەوە) پەلە دەخەنە سەر ( یەکێتی نەتەوەیی ) ئێمە، لە راستیدا لەم هەلە ناسکەی مێژوویی و لە پەنا ئەو هەموو موسیبەتەی کۆمەلایەتی و ئەخلاقی و سیاسی و ئابووری‌یەوە، دەیانەوێ ئاگری شەری قەومیش زیاد بکەن»

وادیارە کابرا لە گوێی گادا نوستوە و یا ڤایتون هەلیگرتوە و یا خۆی لە کوچەی عەلی‌چەپ داوە. ئەوە ١٤ سالە کوردستان لە ئاگری شەری رزگاریخوازیدا دەسووتێ و گەلی کورد لە پێناو وەدی هێنانی مافی نەتەوەیی پتر لە ٦٠ هەزار کەسی فیدا کردوە، تازە ئاغای عەلی میر فطروسی، ویستیارانی مافی نەتەوەیی بە ( هەلگیر سێنەری ئاگری شەری قەومی ) تاوانبار دەکات.

دیارە ئاغای میر فطروسی لە شوتی وەبن هەنگلدانیش شارەزایە، بۆیە هیوا دەر دەبرێ و دەلێ:« بە خۆشیەوە هەم کوردەکان و هەم ئازەریەکان خاوەنی رێبەرانی ئەوەندە لێوەشاوەن کە خۆیان ( لە

هەموو ئێرانیەک پێ ئێرانیترە »!!!
نەک هەر عەلی میر فطروسی، بەڵکوو بە شی زۆری تاریکبیرانی ئێرانی بە راست و چەپەوە قەڵەمی ژاراویان دژی درۆشمی کۆنبووی ( خود موختاري) خستۆتە کار و هەر چەند دمراستەکانی حیزبی دێموکرات بە هەر تک باڵەوە هاوار دەکەن و سوێندو تەلاق دەخۆن کە لە (خود موختاری ) بەدەر چیتریان ناوێ و ( لە هەموو ئێرانیەک ئێرانیترن )، باوەریان پێ ناکەن و شیری (جیاوازی خوازیان) لە سەر سەری راگرتوون و شان بە شانی کۆماری ئیسلامی هەرەشەی نەمانیان لێ دەکەن.
تازە ترین نەخشە بۆ حاشا کردن لە بوونی نەتەوەی کورد و ( فرە نەتەوەیی ) ئێران، لە سیمینارێکدا خراوەتە گەر کە رۆژەکانی ١٢ و ١٣ ی دیسامبری ١٩٩٣لە ژێر ناوی « مەسەلەی میللی و تەواویەتی عەرزی ئێران» لە شاری هامبورگي ئەڵمان ساز کراوە. مەسەلەی حاشا کردن لە بوونی نەتەوەکانی ئێران و تەواویەتی عەرزی ئێران، واتە ( بندەست کردنی نەتەوەکانی غەیرە فارس لە ئێراندا) بۆ شۆڤینیستەکانی ئێرانی ئەوەندە گرنگە کە بابەکی ئەمیر خسروی کۆنە تودەیی و حەسەنی شەریعەتمەداری جەمهوری خواز و داریوشی هومایونی شاپەرست و بیهزادی کەریمی فیدایی ئەکسەریەت و عبدالرزای کەریمی حیزبی دیموکرات لێک کۆ دەکاتەوە، تا بۆ پاراستنی تەواویەتی عەرزی ئێران رێگا بدۆزنەوە.
کاکڵ و جەوهەری باس و شیکردنەوەکەیان بە گشتی بریتی بوە لە : « پێداگرتن لە سەر پاراستنی تەواویەتی عەرزی ئێران و راگرتنی ئێرانی واحد، نەبوونی ستەمی میللی لە ئێران، نەبوونی فەرق و

جیاوازی ناوچەکان لە دواکەوتوویبدا، حاشا کردن لە هەبوونی نەتەوەی جیاواز لە ئێراندا، نەبوونی فەرق و جیاوازی قەومی و نەتەوەیی، هاندانی بێگانان بۆ ساز کردنی بەیت و باوی ستەمی نەتەوە یی و بوونی نەتەوەکان و هتد...»

جگە لە نوێنەری رێکخراوی فیدایی ئەکسەریەت، ئەوانیتر ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی مەشروتەی پێش ۹۰ ساڵ بە دەرمانی چارە سەر کردنی گیرو گرفتەکانی ئێران دەزانن.

ئاغای بیهزادی کەریمی لە سەر ئەو باوەرە بوە کە لە ئێراندا مەسەلەی میللی و ستەمی نەتەوە یی هەیە و ئێران ولاتێکی فرە نەتەوەیە. بۆ ئەوەی تەواویەتی عەرزی ئێران بپارێزرێ، پێویستە مافی دیاریکردنی چارە نووس بدرێ بە نەتەوەکانی ئێران. چاری ئەو مەسەلەش پێکهێنانی کۆماری فیدراتیڤی پارلمانی‌یە کە قەوم و نەتەوە جیاوازەکانی ئێران بە دڵخوازی خۆیان بە ئازادی هەلیبژێرن.»

تاریکبیراتی ئێرانی لەو سیمینارەو لە گشت نووسین و بۆ چونەکانیاندا یەک شتیان لە بیر دەچێ، ئەویش بریتی‌یە لە ویست و ئیرادەو توانا و فیداکاری میللەتی کورد کە بۆ وەدەست هێنانی مافی دیاریکردنی چارە نووس تا سنووری جیا بوونەوە( واتە یەکگرتنەوە) و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی و رزگاری لە چەوسانەوەو بندەستی لە هیچ بەر هەڵستێک ناپرنگێتەوە و رێگاش بە هیچ کەس نادات خۆ بکاتە دمراستی و لە سیمینارو کۆبوونەواندا رێگای پی نیشان بدات.

بە راستی سەیرە. مرۆ ناتوانی بیر لەوە یکاتەوە کە لە دنیای ئیمرۆدا، چەند کەسی راکردووی ئاوارە لە ئورووپا کۆ ببنەوە و خۆ بکەنە دمراستی میللەتێک و ئەرک و ماف و چارە نووسی دیاری بکەن.

ئەم چەند دێڕەم بۆ بەراورد کردنی ڕووناکبیری تورک و تاریکبیرانی ئێرانی کردە نێو ئاخنی نووسینەکەم. داوای لێبوردن دەکەم. لام وایە لە باسەکەم لام داوە و باشترە بێمەوە سەر ڕێگای سەفەرەکەم.

سەعاتی ٨/٣٠ گەیشتینە ئانکارا و چووینە هوتێلێک. ڕۆژی دوایی کاک خەلیل کارێکی هەبوو، دەبوایە ئەنجام درابا. خۆ ناکرێ مرۆ لە نووسیندا هەر بە ڕەقە ڕێدا بیکوتێ و ئاورێک لەم لاو لا نەداتەوە و دوو قسەی خۆش نەکاتە ئاویتەی نووسینەکەی. لام وایە چ قەیدی نیە ئەگەر نووسەر بۆ حەسانەوەی خوێنەری بەڕێز یەک دوو نوکتە و قسەی خۆشیش بخاتە نێو دێری نووسراوەکانی.

مۆنتی فیلسوف و نووسەری بە ناو بانگی فەرانسەیی دەڵێ:« ئەگەر لە خوێندنەوەی کتێبێکدا تووشی دێری قەبەو ویشک دێم، کتێبە کە لەو لای دادەنێم. چونکە نووسین دەبێ شادی هێنەر بێ، نەک پشو بڕ. ئەدەبیات دەبێ بەشێک بێ لە شادی و خۆشی.»

ئەم نووسینەی من بە ئەدەبیاتیش حیسێب نەکرێ قەیدی نیە بەڵام با دوو قسەی خۆشی تێدا بێ. بەیانی لە هوتێل هاتینە دەر، بێ ئەوەی کارتی هوتێل و یا ئادریسی وەر بگرین. سواری تاکسی بووین بە دوای کاری کاک خەلیل دا. لام وایە تاکسیش بەم بەیانە ویستبووی تۆزێ بە ناو شاردا بمانگێڕێ و شارمان نیشان بدات. چونکە کاک خەلیل گوتی: ئەم شوێنەی دەچین نیزیکە. بەڵام ڕاست ئەو کاتە گەیشتین کە پارەی تاکسی بوو بە ١٠٠ هەزار لیرە. کاری کاک خەلیل زوو تەواو بوو هاتینە دەر کە تاکسی بگرین و بچینەوە. بەڵام بۆ کوێ؟ نە ناوی هوتێل دەزانین و نە شوێن و ئادرێسی..

وێستاین بە دەم پێکەنینەوە بیرمان دەکردەوە. بەڵام فایدەی نەبوو، بیری چی؟ ئەگەر بیرمان وا تیژ بایە کارتێکی هوتێلمان وەر دەگرت. ناچار ناوی شوێنێکمان گوت، سواری تاکسی بووین. زوو گەیشتێ هەو نەبوو. دابەزین و توزێکی تر بە هۆشی خۆمان پێکەنین و ئاخرەکەی رێگامان دیتەوە. تاکسی بگرین بۆ تەرمینالی ئوتوبوسی فرۆکەخانە. لە وێشەوە تاکسی بگرین بە رێگای شەودا، بەڵکوو توشی هوتێلەکە بێن. فیکرێکی خاس بوو. بەم شێوەیە هوتێلمان دیتەوە و چووین ئەمجارە کارتێکمان وەرگرت . گەلێکیش بە هۆشی خۆمان پێکەنینمان هات.

ڕۆژی دوایی ئێوارە سواری فرۆکە بووین بۆ دیار بەکر. کە دابەزین و جانتامان دەست دانێ، کابرایەک هاتە پێش و بە کرمانجیەکی رەوان پرسیاری کرد: « بۆ کوێ دەچن ؟ »

– بۆ کوردستان.

– کورۆ قەدری ! وەرە ئەو برایانە بەرە هوتێل و بەیانیش سواریان کە بۆ خاپور.

سواری تاکسی قەدری بووین و توزێکیش دڵمان خۆش بوو کە وا تووشی کوردێکی حەلاڵ زادە بووین. لە هوتێل جێمان گرت و شەو چووینە دەر نان بخۆین. کاک خەلیل شارەزا بوو چووینە رەستورانی ( بابەک ) رەستوران پر بوو هەر زمەی دەهات. دەستەیەکی گۆرانی بێژ و موسیقا ژەن، بەزمیان گەرم کرد بوو. تا دەهات گەرمتر دەبوو. دەستکرا بە شایی و دیلان و گۆرانی شورشگێری و رەستوران دەلەرزی.

یەک لە گۆرانی بێژەکان بە ناوی (عەلی ئاکتاش) هاتە لام و

گوتی تۆ وە ئاپۆ موسا عەنتەر دەچی. ساڵی پار لێرە بەدەستی فاشیستەکانی تورک شەهید کرا. پاشان گوتی :« ئەز لە خزمەت سەیدا جیگەر خوێن بووم. نووسینی عەرەبی دەزانم. شیعرێکی جیگەر خوێنی خوێندەوە. تەلیفونی دامێ و گوتی لە گەرانەوە دا ئەشێ میوانی من بی.

لە بارو دۆخێ ئەو رۆژەی کوردستانی تورکیادا کە وڵات کرا بوە ناوچەی نیزامی و حاڵەتی شەری پێوە دیار بوو. رۆژنامەکانی تورک لاپەرەکانیان بە باسی شەر و پەلاماردانی ( p.k.k. ) و مام جەلال رەش کرد بۆوە، دەکرا بەزم و شایی ئەو شەوەی رەستورانی بابەک لە دیار بەکر ، بە بەر هەڵستێکی ئاشکرای حکومەتی تورک دابنرێ. ئێمە گەراینەوە بۆ هوتێل، بەڵام شایی و بەزم هەر درێژەی هەبوو.

قەدری بەیانی زوو دەسەرمان بوو. بێ ئەوەی هەقی رێگای لە گەڵ ببرینەوە سوار بووین و بەرەو خاپور کەوتینە رێ. لە دیار بەکرەوە تا خاپور لە ١٣ جێگا کونترۆڵ و پشکنین هەیە. نێوە نێوە تانک و زرێلیش وەستاون و چەند عەسکەرێک تفەنگ بە دەست لە دەوری و بەریان چەقیون. شوێنەواری تەقەو شەر نابینرێ، بەڵام وڵات لەم مەڵبەندە لە حاڵەتی شەر دایە.

لە جزیری لاماندا چایەک وەخوین. شارێکی چۆڵ و فەقیر و رەمزی بەد بەختی و چارە رەشی. دوکان و مغازەی سەر شەقام پاکیان داخرابوون. هێندێ خەڵکی رەش و رووتی بێکار دەهاتن و دەچوون و جم و جۆڵی ژیان نە دەبینرا.

لە پێش چایخانێک دانیشتین و چەند کەسێکمان لێ کۆ بوونەوە.

پرسیم : « ئەو دوکانانە بۆ داخراون ؟ »

یەکیان گوتی :« لە بەر بێکاری. کار نیە ، بازار نیە.. »
یەکی تر گوتی : « نەکارن والاکەن . شەرە»
- کوا. هیچ شەر دیار نیە. ئێمە شەر مان نەدیت
لاوێکی مێر منداڵ هەڵیدایە و گوتی : « ئەرێ شەرە. بێ شەر چێ نابی »
ماشینێک عەسکەرو زریلێک تێپەرین.
- ها بروانە... ئەڤە نەشەرە.؟ شەو رۆژ ئەوهایە.
ویستم رەسمیان بگرم. گوتیان مەکە. عەسکەر ببینن کامیرای تە دەگرن.
لەو لای جزیرێ کەمپێکی کوردەکانی خوارووی کوردستان هەر مابوو. هێندێ خێوەتیان بۆ هەڵدا بوون. ئەوەی پتر لە هەژاری خەڵک و لە سەیتەرەی عەسکەری تورک لەم رێگایەدا، رێبواری کورد دەخاتە خەفەت و بیر کردنەوە. دەجلەیە. بەڵێ ئەم روبارە بە پیت و بەرەکەتە لە چیاکانی کوردستانەوە دەکەوێتە رێ و پتر لە ٦٠٠ کیلو میتر بە کوردستاندا خوارە پێچە دەکات و بەلام بەو بەری دەڵێن سوریا و ئەم بەرەش بە تورکیا ناو دەبەن.
(ماڵ لە خانە خوێ حەرام کراوە
مەسەلەی کوردە و لە کورد رووی داوە)
ئاوی کوردستانە و بێگانە فیزی پێ لێدەداو کێشەی لە سەر دەکەن. سەعاتی ١١ گەیشتینە خاپورر. کوردستانە لەتکراوە و گۆیا سنووری عیراق و تورکیایە. داخ و خەفەتێکی دیکە.
ویستمان پارە بدەین بە قەدری، زۆر بە راشکاوی گوتی : ١٥٠ دۆلار ! . تاکسی دیار بەکر خاپور ١٠٠ دۆلارە. کابرا لە ١٥٠

نەهاتە خوارێ و وەریشی گرت.

لە گومرگ و پولیسی تورک زوو دەرباز بووین و لە سەر پردێ هەوەڵین وشەیەکی گوێچکەی زرینگاندمەوە بە خێر هێنانی سنور داری کورد بوو، بە زمانی خۆم دەیگوت : « بەخێر هاتن »

لە بیرمان نەچێ کاتی سەفەر بۆ ِلاْتانی دنیای دوا کەوتوو، بە تایبەت ولاْتانی عەرەبی، دەبوایە بۆ مۆر کردنی پاسپۆرت و ڤیزا بە سەعات لە پشت دەرگاو لە بەر پەنجەرە وێستابایین و کرد بامانە پاڵەو پەستە، تا مۆرێکیان لە پاسپۆرت دەدا. پشکنینی جانتا و پرسیاری هاتەران پاتەران و راگرتن جارزی دەکردین. تەنانەت لە ولاْتی خۆشت لە جیاتی ( براگیان بۆ کوێ دەچی ئێستا ) بە زەحمەت لە چنگ( انزل و هویتک)ی عەرەبی دەر باز دەبووین.

ئێستا دەچی لە هۆدەی کونترۆڵی جوازات وەژوور دەکەوی، دادە نیشی بە زمانی خۆت لە گەڵ مەعمورەکان دەدوێی. نە پشکنینی جانتا و نە پرسیاری سەیرو سەمەرە. زانینی قەدری ئەم نیعمەتە فەرزە. دەبا کوردیش جارێک لە مێژوودا، لە ولاْتی خۆی سنووری نیشتمانی خۆی کونترۆڵ بکات و بە سەر نیشتمانی خۆیدا زاڵ بێت و بە دنیاش نیشان بدا کە دەتوانێ هەم سنووری خۆی بپارێزێ و هەم کارو باری ولاْتی خۆی بە رێوە بەرێ و هەم لە گەڵ گەلانی دراوسێش بە ئاشتی بژی.

لە سەر پردێ کە بە سنور ناو دەبرێ، لە پەنا رەسمی سەرۆک بارزانی نەمردا، بە کوردی نووسراوە:« بە خێر هاتن بۆ کوردستانی عیراق». دیارە ئەم نووسینە وەلاّم دەورەوەی سیاسەتی ئێستای حکومەتی کوردستان و لە بەر چاو گرتنی بارودۆخی سیاسەتی ئێستای

جیهان و ناوچەیە. ئەکینا هەق وابوو بنووسری :« بە خێر هاتن بۆ کوردستانی ئازاد ».

دوای تۆمار کردنی پاسپۆرتەکان، چووینە « مەکتەبی جەوازاتی رزگاری»، بە پێچەوانەی پۆلیسی تورک و شوێنی دیکە کە دەبێ لە پشت دەرگا بوەستی، دانیشتین و بەخێر هاتن کراین. چەند کەسی بێکار لەوێ دانیشتبوون و بە ئاخافتنی جۆراو جۆر و باسی عەرش و فورش، مەجلیسیان گەرم کرد بوو. ئەوە نیشانی دەدا کە کارەکان هێشتا بە روالی کوردەواری دەرۆن و نەکەوتوونە سەر روالو سیتمێکی ئیداری و حکومەتی.

دوای ئەوەی پاسپۆرتی کاک خەلیل تەواو بوو، ٢٥ دۆلاری رەسمی چووتە زۆۆری داو رەسیدی وەر گرت، برادەری مودیری مەکتەب بە دەنگ ناوی منی خوێندەوە. یەک لەو برادەرانەی لەوێ دانیشتبوو، رابوو، گوتی:«جەنابت کاک کەریمی حسامی یە؟» بەگەرمی ئامێزی پێدا کردم و بە خێر هاتنێکی گەرم. من پێشتر بە خزمەت کاک لوقمان بەرزنجی نەگەیشتبووم، ئەویش منی هەر لە دوورەوە ناسیبوو. باسی نووسراوەکانی منی کرد، باسی ئەو مەکتەبەمان کرد کە کونگرەی ئەمریکا بۆ کۆ کردنەوەی کتێبی کوردی کردوویەتەوە و کاک محەمەر عەسکەری لە قاهیرە لە بالیۆز خانەی ئەمریکا بەم کارەوە خەریکەو نامەی بۆ بنکە کولتوریە کوردیەکان ناردوە کە کتێبی بۆ بنێرن و نامەیەکیش بە من گەیشتوە. کاک لوقمان گوتی : کتێبێکی زۆرمان کۆ کردۆتەوە بەلام تا ئێستا حکومەتی تورکیا رێگا نادا کە بیان نێرین. پاشان سەری بردە بن گوێی مودیری مەکتەب. ناردیان چایان هێنا.

کاتی رابووم که ٢٥ دۆلاره بدەم، کاکی مودیر ئەم وەرەقەی دا دەستم کە بە عەرەبی نووسرا بوو:

« الی من یهمه الامر. یسمح لحامل الورقه السید عبدالکریم حسامی بالدخول الی کردستان و غیر مشمول بدفع الرسومات لکونه کاتب کردی13 ».

گوتم زۆر سوپاس، بەلام با ٢٥ دولارەش هەر بدەم. گوتی نابێ. ئەگەر پارە وەر گرم دەبێ لە وەرەقەکە بینووسم. بە بۆنەی هاتنەوەت بۆ کوردستان لەم پارەیە مەعافی. خۆت ئەم پارەیە دەدەی بە کێ بیدەیە. خۆت دەزانی. »

گوتم خۆزیا وەرەقەکەت بە کوردی نووسیبایە. ئەمە زۆر گرنگە بەڵگەو نووسراوەکانی حکومەتی بە زمانی کوردی بنووسرێن. گوتی : « لە لایەن حکومەتەوە بە رەسمی ئەمرمان پێ نەکراوە. »

دانیشتم چاوەڕوان بووم تا کاک خەلیل ساز دەبێ. نازانم لە ئاسایش و عەلاقات چ کارێکی هەبوو. لەو ماوەیەدا برادەرێک لە گەڵ خێزانی پێویستی بە وەرەقەیەک هەبوو. چەند جار لە جەوازاتەوە دەیانناردە ئاسایش و لە وێوە دەیانناردەوە جەوازات. کابرا دەپاراوە دەیگوت: « چیتر ئەو دەستەو دەستم پێ مەکەن. لە بەیانیەوە لە سەر ئیمزایەک مەحتەلم. »

کۆمەڵێک خەڵکی دیکەش هاتن و دانیشتن. من بە برادەرێ مەسئولی جەوازاتم گوت:« ئێمەی کورد بۆ وەرەقەیەک ئەوەندەیان دەستاو دەست پێکردووین و رایانگرتووین و تڕزیان کردووین کە لە حکومەت و هەر چی ئیدارەیە بێزار بووین. ئێستا کە خۆمان لە جێگای ئەوانین، تکایە با لاسای ئەوان نەکەینەوە. بە گوێرە یاسا

کاری خەڵک راپەرێنین و کارێکی وابکەین کە خەڵک هەست بەوە بکات کە حکومەتی خۆیەتی و شانازی پێوە بکات»

برادەرانی لەوێ دانیشتبوون و هەموویان بادینی بوون، گوتیان :« ئەرێ برا تۆ لەم سەفەرە کاک مەسعود دەبینی؟»

– نیازم وایە و حەز دەکەم بیبینم. بەلاّم نازانم داخوا کاری زۆر و سەر قاڵبوونی رێگای ئەوە دەدا کاتی دیتن بۆ من تەرخان بکات؟

گوتیان : رەجا دەکەین بێژە مەسعود زاخۆ ٩رۆژە بێ ئاوە. تەحالف بە تانکیر ئاو دێنن، ئەویش لە بەر مەعمور و دەوڵەمەندەکان وەبەر کەس ناکەوێ. تەنەکەی بە ..١ دینار دەیبەن. ئەوەندە بارانە نەبایە خەڵک قر دەبوو. ئەگەر لە بەر بەعس نەبایەو سەددام پێ خۆش دەبێ، ئەگینا انتفاضە مان دەکرد و یەک مرۆی حکومەت و حیزبیمان لەم شارە نەدەهێشت.»

گوتم ئەگەر کاک مەسعود ببینم، راسپاردەی ئێوەی پێ رادەگەیینم.

کاک خەلیل کارەکەی تەواو بوو. هات گوتی با برۆین.

– سەیارەت گرتوە؟ با سەیارە یەک بگرین.

– ئەوەتا سەیارەیەک وەستاوە. برادەران دەڵێن بەو سەیارە برۆن ئەمینە و دەیناسین و سەر بە خۆمانە.

– باشە. با قسەی لەگەڵ بکەین، بە چەندی دەمانباتە هەولێر. با وەک قەدریمان لێ نەیە.

– پێی ناوێ. هەموو دەیناسن. زیادمان لێ ناستێنێ. دەر کەوت کورد بە جارێک و دوو جاران ئاقل نابێ.!!

سواری سەیارە بووین، کابرای ئاژوەر ناوی حاجی بوو. لە سەیتەرە

له وەڵامی پرسیاری مەعمورەکاندا گوتی :

« بۆ هەولێر دەچم، میوانیماڵی گەورەیە »

- بە خێر هاتن، خواتان لە گەڵ.

لەوە کە کابرا گوتی : « میوانی ماڵی گەورەیە » هەستم کرد کە نابێ زۆر سەر راست بێ.

حاجی گوتی : « ئێمە دە سەیارەین عایدی گومرگین. ئەو میوانی لە خاریجەوە بێن بە ئێمەدا دەیانێرن تا بە سلامەتی بگەنە هەولێر. »

لە زاخۆ لاماندا نان بخۆین. ویستی لە پێش کەبابخانەیەک سەیارەکە رابگرێ، شوێنەکە قەدەخە بوو. پۆلیسی هاتو چۆ هات. حاجی سرتەیەکی لە گەڵ کرد و سەیارەی راگرت. کە تەواو بووین پولیسەکە لەوێ وێستا بوو. نازانم لە گەڵ حاجی چی‌یان گوت و چی‌یان کرد، سوار بووین و کەوتینە رێ.

حاجی گوتی: « هەموو شت بە پارەیە. ۱.. دینارم دا بەو پۆلیسە بۆ ئەوەندە راوەستانە. »

- بۆ دەت دایە؟ بۆ لە شوێنێک نەوەستای کە جێگای وەستان بوو؟

- چی بکەم؟ نەت دیت چەندە قەڵە باڵغە؟ شوێن گیر نەدەکەوت. قەی ناکا. شورتە فەقیرە، مەعاشیان کەمە.

کەوتینە رێ. جادەی نێوان زاخۆ- دهوک لە بەر قەڵە باڵغی و هاتوو چۆی ماشێنان وە جادەکانی ئورووپا دەچوو.

بێجگە لە ماشێنی سواری دەیان لۆری دەرێدا بوون بەرەو هەولێر و گەرانەوە. حاجی دەیگوت: « ئەو لۆریانە ئەرزاق و شتومەکی تیجارەتی دێنن. لە سنوور بە ناوی هەولێر گومرگ دەدەن و تۆمار

دەکرێن. کە لە دهۆک تێپەڕین، لە سەیتەرەی سەر ڕێگای موسڵ، پارەیەک دەدەن و بۆ موسڵ دەچن. لۆری وا هەیە ۱۰هەزار دینار دەدا کە بچێتە موسڵ. لە هەولێریش لە چەند جێگا ئەم باسەم بیست. دەیانگوت شەو لە هەولێر لۆری لە سیغار و ئەرزاق بار دەکرێ و بۆ موسڵ و بەغدا دەڕوات. کابرایەک دەیگوت:« هەر چەندی بیدەین بە سەیتەرەو گومرک هەر قازانجمانە. هەر ئەوەندە بگەینە بەغداو نەگیرێین، هەمووی پڕ دەکاتەوە»

نوێژی شێوان گەیشتینە قەسرۆک. حاجی لە ڕێگا لایدا و دابەزی نوێژی شێوانی کرد. زەوی تۆزێکیش تەڕ بوو، بەڵام بۆ ئەوەی کڵاو چیەتی خۆی بشارێتەوە، دەبوایە لە سەر زەوی تەڕیش نوێژێکی بکات. ئێستا ئیتر بە شەو دەڕێگا داین. حاجی گوتی : « لە ڕێگا دا چەتەو ڕێگر هەن. چەند جار خەڵکیان ڕووت کردوە و کوژراویش هەبوە. ئەگەر تووشی چەکداران بووین و بە ناوی پێشمەرگە ڕایان گرتین، دەڵێین : نەخۆشە، لە خەستەخانەی دهۆکێ ناردوویانە بۆ هەولێر ، تۆ خۆت هیلاک کەو بێژە نەخۆشم.

لە حاجی وەشک کەوتم . لە نیزیک حەریر و باتاس حاجی گوتی:« لە ڕێگای شەقلاوە شارەزا نیم و هەر بە کۆیەدا چوومە هەولێر. سەیارێکمان لە پێشدا بوو، گوتمان بە دوای ئەودا برۆ.

# هەولێر، پێتەختی حکومەتی هەرێمی کوردستان

سەعاتی دەو نیوی شەو گەیشتینە هەولێر و چووینە دارەمان. ئەو شوێنەی بەعس دەرکراوەکانی کەرکوکی لێ کۆ کردوونەوە، ماڵی کاک محەمەدی خزمی کاک خەلیل. حەسارێکی گەورە، ماڵێکی ئاوەدان و خەڵکێکی میهرەبان و دڵ ئاواڵە. هەر وەک ناسیارو ئاشنای قەدیم بین، شەو خاو خێزان لێک کۆ بووینەوە. نان و چێشتیان ساز کرد. سەرە رای هیلاکی رێگا تا دوای نیوە شەو درنگ نەخەوتین. باسی دەرکردن و راگواستنی خزیانیان دەکرد و رەفتاری فاشیستی حکومەتی بەعسیان دێناوە بەر چاو و برسیەتی و بێکاری و ئاور لێ نەدانەوەی حکومەتی هەرێمیان دەکردە ئاوێتەی قسەکانیان.

بەیانی حاجی نانو چای خوارد و ویستمان پارەی بدەینێ، داوای ۱۲ دۆلاری کرد. واقم ور ما. گوتم لە زاخۆوە تا هەولێر سەیارە بە چەندی دێت؟

گوتی : « بۆ خۆم نیە. عایدی گومرگە و وایان داناوە. من لە ژیانم دا قەت ئاوا تەسلیمی کلاو چیەتی نەبووم. کاک خەلیل بە ۱۰۵ دۆلار رازی کرد، پارەی وەر گرت و رۆیشت.

کاک محەمەدی خانە خوێ سواری تاکسی کردین بۆ نێو بازار، لە باری ئەمنیەتەوە پرسیاری هوتێلەکانم کرد، گوتیان هوتێل (شیرین پلاس) شوێنێکی ئەمینەو میوانی دەرەوە پتر لەوێ دادەبەزن. ماڵی

دۆست و ناسیار و ئاشنای قەدیم هەبوون، بەلاٚم بە راستی نەمدەویست ببمە سەر باری مالێکی دۆست. بە تایبەت کە چاوە روان بووم دوو برادەریشم لە ئێرانەو بێن بیان بینم.

بەر لەوە بچمە هوتێل، چوومە زانکۆ و سوراخی دوکتور جەمشیدم گرت. لە زانکۆ چومە ژووری عەمید، دوکتور عبدالله حداد کە لە پاریس یەکترمان دیبوو، بە گەرمی پێشوازی کردم و ناردی چایان هێناو تۆزێ یادی دیداری پاریسمان نوێ کردەوە. دوکتور جەمشیدم دیتەوە. نە چوونەوەی کوردستان و نە ماوەیەک دووری و نە ئەندامەتی کومیتەی ناوەندی حیزبی تازە و نە تازە زاویی، هەستی برایەتی و دۆستایەتیان کەم نەکرد بۆوە. تۆزێ دانیشتین گوتم : جارێ با من برۆم لە هوتێل شوێنێک دیاری بکەم. دوکتور بە جیددی سەیری کردم و گوتی : « هوتێلی چی ؟ عەیب نیە ؟ تۆ بێ‌یە هەولێر و بچی لە هوتێل میوان بی؟ دە چیە مالٚی مومتازی، مالٚی خۆتە، ئەوەش ژمارە تەلیفون و منیش ئێوارێ دێمەوە.

نازانم بە چ زمانێک سوپاسی کاک محەمەدی خانە خوێ و کاک خەلیلی بکەم. تا ئێوارێ کە بردیانمە مالٚی کاک مومتازی، لە بازار گێرایانم و لە گەلٚم بوون.

ئێوارەی رۆژی ٩٩٣/١١/١٤ میوانی مالٚی مومتاز حەیدەری بووم. راست نیە وشەی میوان بە کار بێنم. باشترە بێژم بوومە خاوەن مالٚ و خانە خوێی میوانان. چونکە تا ئەو رۆژەی گەراومەوە، هیچ رۆژێک و یا بلٚێم هیچ کاتێک بێ میوان نەبووم. زیلانی مەند و خوێن شیرین و روح سوک و ژیکەلٚەش تاوێک لە بەر هێنانی ئاو وچایی و شتی پێویست نەحەساوەتەوە. کاک مومتاز سەعاتێک بە تەنیای

نەهێشتووم و لێم خافڵ نەبوە. لە توانام دا نیە باسی میهرەبانی و جوامێری و میوانداری و خزمەتی خوشکە رەمزی و کاروان و سازانی خوشەویست بکەم. ئەگەر زەحمەت و میوانداری ئەوان و حەسانەوەو ژیانی ئاسودەی خۆم لەو ماوەیەدا بنووسمەوە، بە قەولی فارسان« مثنوی هفتاد من کاغذ شود » هەر ئەوەندەم پێدەکرێ لە دڵەوە سوپاس و پێزانینی خۆم رابگەیێنم.

## دیدار و چاو پێکەوتن

وەک لە سەرەتاوە گوترا، دوای ئازادی کوردستان بە ئاوات بووم بە دیداری نیشتمانی ئازادو سەردانی دۆست و برادەران، تۆزێ خەم و پەژارەی ئاوارەیی و دوورە وەتەنی لە سەر دڵم لا بەرم. بۆم نەلوا، تا ئێستا ئەوە لە کوردستانم. خۆ بۆیە نەچوو بوومەوە هەر بە سورانەوەی نێو بازار کات رابوێرم. دەمویست لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوری و ئابووری ئەزموونی تازەی خوارووی کوردستان شارەزا بم. ئەوەی ئێمڕۆ لە خوارووی کوردستان دەبینرێ، دەسکەوتێکی گەورەو ئەزموونێکی نوێ و رێگایەکی ناهەموارە. رووداوێکی ئالۆز و بە گرێپوچکەیە. شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی هاسان نیە. مەسەلەیەکە لە چوار چێوەی ناوچە چۆتە دەر و باری نێو نەتەوەیی بە خۆوە گرتوە. لە توانا دا نیە بە مانگێک و ٢٠ رۆژ بچیە ناخی رووداوەکان و سەریان لێ دەر کەی.

هاسانە یەکێک بچێتەوە کوردستان و چەند رۆژان بسورێتەوە و بە

هەوا باسی ڕووداوەکان بکات. بەڵام وانیە، زۆری پێدەوێ.

لەو سەفەرەدا مەبەستم بوو ئەگەر کاک مەسعود و مام جەلال لە بەر پرکاری کاتیان هەبێ، چاوم پێیان بکەوێ.

بەر لە دیتنێ ئەوان سەردانی ڕۆژنامەکان و بارەگای حیزبەکانی تر و دیدارێ هێندێ دۆست و برادەرم بە پێویست دەزانی. دەمویست شارەزایێک پەیدا بکەم و ئاگاداری وەزع بم.

ڕۆژی ١١/١٥ بەم هیوایە کە کاک عەزیز محەمەد لە هەولێرە، چوومە بارەگای مەکتەبی سیاسی حیزبی کومونیستی کوردستانی عیراق، داوای دیتنی کاک کەریم ئەحمەدم کرد. کاک مەلا حەسەن هات، دوای بە خێر هێنان گوتی : کاک عەزیز سەفەری کردوە و کاک کەریمیش چۆتە سولیمانی. پاشان کاک عومەرعەلی شێخ سکرتێری حیزبی کومونیستی کوردستانی عیراق هات، نیزیکەی نیو سەعات دانیشتین و چاییمان خواردەوە و جگە لە بە خێر هێنان و چاک و چۆنی یەک وشەی دیکەمان لە زاری نەهاتە دەر. هەر دەتگوت منیان نەدیوە و کابرایەکی ئوروپاییم هاتوومە هەولێر. مەلا حەسەن گوتی : « لە گەڵ ڕێنگای کوردستان وتو وێژێک بکەن. »

گوتم پرسیارەکان بنووسن، وەڵامیان دەدەمەوە.

پاشان چوومە جەریدەی برایەتی. لە گەڵ کاک فەرهاد عەونی ناسیاری کۆنمان تازە کردەوە، باسی وەزعی کوردەکانی ئوروپا و بارودۆخی سیاسی و ڕوشنبیریمان کرد. بە شێوەی ڕۆژنامە گەری بێ ئەوەی بە خۆم بڵێن، چەند ڕەسمێکیان گرت. چووینە جەریدەی کوردستانی نوێ. بەم ئیعتیبارە کە پێشتر وتارم بۆ نارد بوون، لە گەڵ برادەرانی کوردستانی نوێ وەک هاو کارێک باسی ڕۆژنامە و نووسین

ودەرەتانی بڵاو کردنەوە و روشنبیریمان کرد. کوردستانی نوێ لە ژمارەی رۆژی ١١/١٦ دا خەبەری گەرانەوەی مني بۆ کوردستان بڵاو کرد بۆوە.

کاک مومتاز حەیدەری تەلیفونی کرد بۆ شیخ لەتیف بەرزنجی و گوتی فلانکەس لێرەیەو دەیەوێ ئەگەر کات هەبێ چاوی بە مام جەلال بکەوێ. دوای ماوەیەکی کورت شێخ لەتیف تەلیفونی کردەوەو گوتی:« بەیانی سەعاتی.٩/٣ مام جەلال لە مەکتەبی خۆی چاوە روانی دەبێ.

رۆژی دوایی لە کاتی دیاریکراودا چووینە مەکتەبی مام جەلال. بە گیانێکی برایانە پێشوازی و بە خێر هاتنی کردین. دەورەی تەواوی بیرەوەریەکانم وەک دیاریەکی شوانانە پێشکێش کرد. زۆری پێخۆش بوو، گوتی لە ئوروپاوە ئەوە چاکترین دیاری‌یە.

دوای ئەحوالپرسی و پرسیاری چۆنیەتي ژیان و شوێن و کار، گوتی :« بە تەما نی سەری برادەرانی کۆنت بدەی؟ »

- خەیاڵێکي ئاوام نیە. ئەوان هاتوونە سوید سەری منیان نەداوە، جا من بۆ سەری ئەوان بدەم.

- جا تۆ وەک ئەوان مەکە. پێم باشە سەرێکیان بدەی. دەو قسەی خێریش بکەی بەڵکوو رێکیان خەیەوە. من زۆرم هەوڵ دا هیچم بۆ نەکرا، بەڵکو تۆ کارێک بکەی.

- جا ئەگەر تۆ هیچت بۆ نەکرا بێ و شەقی زەمانە وریای نەکرد بنەوە، خۆ پێوە ماندوو کردنیان بێ فایدەیە. ئەو برادەرانە ئێستاش پێیان وانیە کە دنیا گۆرانی بەسەردا هاتوە. ئێستاش لە سەر (رێبەرایەتی بزووتنەوەی کورد) شەریانە.

پاشان لە سەر وەزعی جیهان و بارودۆخی کوردستان و حکومەت و پارلمان و ناتەواوی و سەر هەلْدانی جاروباری هێندی ناکۆکی باسێکی بابەتی و خۆشمان هەبوو. مام جەلال بە راشکاوی هێندێ کەم و کوری و ناتەواوی سیستمی فیفتی فیفتی وە بیر هێنایەوەو هەر لەو کاتەشدا هێندی هەنگاوی لە باری باسکردن وەک : زۆر بوونی داهاتی گومرگ و چاپکردنی کتێبی مەدرەسەکان و ئاوەدانکردنەوەی دێهات و چاک کردنی جادەکان و زیاد کردنی مەعاشی ماموستایان و کردنەوەی بنکەی دەرمانی و ...هتد. ئەوەشی گوت : کە کوردستان دوو قات لە گەمارۆی ئابووری دایە. بۆ وەکار خستنی فابریک و کارگاکان کەس یارمەتیمان نادا. بۆ چوون و راشکاوی قسەکانی بۆ من جێگای سەرنج و کەلک وەر گرتن بوون.

پاشان گوتی: ناتەوێ سەری سولیمانی بدەی؟

گوتم بەتەمام سەری برادەرێکی بدەم کە پێکەوە لە زیندان بووین. دێموکراسی حیزبی دێموکرات ئەویشی وەلا ناوە. لەم بوارەشدا هێندێ قسەی بە نرخی کردن. گوتی :« هەر وەختی ویستت بچی تەلیفون بکە تا پێشمەرگە و سەیارەت بۆ بنێرم و لە وێش میوانی مەلْبەند دەبێ. دوای گەرانەوەشت تەلیفون بکە پێکەوە نانێکی بخۆین و پتریش قسان بکەین. گوتی: تەلیفونی‌من بدەن بە کاک کەریمی ، هەر کاتی ویستت تەلیفون بکە. لە گەلْ کاک مومتاز حەیدەریش سەبارەت بە کەم و کوری نووسین و روشنبیری و رۆژنامە گەری موناقەشەیەکی دێموکراسیانەیان هەبوو. نەمویست پتر وەختی بگرم، ئیزنم لێ خواست، مام جەلال گوتی :« هەموو کەس ببینە، ئەندامانی پارلمان، روناکبیران، نووسەران و خەلْکی دیکەش. مالاْواییمان لێ

خواست و گەراینەوە. سەردانی بارەگای حیزبی زەحمەتکێشانم کرد. کاک قادر عەزیز بەخێر هاتنی کردین. بە درێژی باسی بارو دۆخی کوردستان و خوارووی کوردستانمان کرد .هەر لەوێ داوای وتووێژێکی تەلەڤیزیۆنیان کرد. ئەوان پێشتر لە تەلەڤیزیۆنی خۆیان فیلمێکی متیان بڵاو کرد بۆوە کە لە سوید هەڵیان گرتبوو. داوامان نا درێژتر وتو وێژ بکەین.

دوایە چوومە سەر دانی بارەگای حیزبی کاری سەر بە خۆیی کوردستان کە تازە دامەزراوە و کۆنگرەیان گرتبوو.

ئەم حیزبە لەم برا کوردانە پێک هاتوە کە پێشتر ئەندامی حیزبی کومونیستی عیراق بوون. بە شێک لەو کوردانەی کە ئەندامی حیزبی کومونیستی عیراق بوون، پاش ئەوەی کە حیزبی کومونیستیان بە جێ هێشت،( واتە بە ئیستیلاحی خۆم پاش بادانەوە) هێندێکیان چوونە نێو پارتی و هێندێ نێو یەکێتی و هێندێکیش ئەم حیزبەیان پێک هێنا و لەم دواییانەشدا لە گەڵ حیزبی زەحمەتکێشان و رێکخراوی تێکۆشانی رەنجدەرانی کوردستان لیژنەیەکی (هاریکاری چەپە کوردستانیەکانیان) پێک هێناوە.

رۆژی ١٦/١١/نیواری ماموستا گۆران ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هاتە لام. دوو پێشمەرگە و سەیارێکی هێنا بوو، گوتی ئەو پێشمەرگانە پێویستە لە لات بن تا دەگەرێیەوە. وێرای سوپاسێکی لە رادە بەدەر هیچ بە پێویستم نەزانی پێشمەرگەم لە لابن و لە نێو شار لە گەڵ من بگەرێن. من ئەو ساڵانەی دوای هاتنە سەر کاری حکومەتی ئیسلامیش لە مەهاباد قەت پێشمەرگەم لە نێو شار بە دواوە نەبوە. ئاخری ماموستا گۆران کلاشنیکۆفێکی بە جێ

هێشت و گوتی با ئەوەت هەر لە لا بێ و گوتی بۆ هەر شوێنێکیش بچی تەلیفون بکە ماشێن و پێشمەرگەت بۆ دەنێرین.

رۆژی ١١/١٧/لە رێگای کاک عەزیز نەژاد سورمەییەوە، داوای چاو پێکەوتنی کاک مەسعود بارزانیم کرد. دوای تاوێک کاک عەزیز خەبەری دامی کە کاک مەسعود رۆژی شەمۆ چاوە روانتە و لە لای ئەویش نان دەخۆن.

ئێوارێ ئەم نامەیەی خوارەوەم بۆ هات: « بۆ بە رێز کەریمی حسامی - بە سلاوێکی گەرمەوە.

بە رێزتان بۆ بەشداری لە کونگرەیەکی رۆژنامە گەری کە لیژنەی بالای هاریکاری چەپە کوردستانیەکان سەبارەت بە راگەیاندنی هاریکاری چەپە کوردستانیەکان دەبەستێ داوەت دەکەین. کات و شوێنی کۆنگرە رۆژنامە گەریەکە سەعات (٣/٢.) دوای نیوە رۆ پێنج شەمە ١٩٩٣/١١/١٨ لە هوتیل شیرین پلاسە. بەشداریتان مایەی سەر فرازیمانە. ١٩٩٣/١١/١٧...لیژنەی بالای هاریکاری چەپە کوردستانیەکان.

تەلیفونم بۆ کاک جەوهەر نامیق و دوکتور عیزالدین مستەفاو کاک نژاد کرد . دیار بوو ئەوان ئێستا سەروک و ئەندامی پارلمان بوون و لە بەر کارو تێکۆشانی زۆر کاتیان نەبوو سەرم بدەن. منیش لەبەر سەردانی نووسەران و کەسانی سیاسی و کۆمەلایەتی هەولێر کە رۆژ بە رۆژ سەر فیرازیان دەکردم، پێرا نەگەیشتم لە پارلمان بچمە خزمەتیان.

رۆژی ٩٣/١١/١٨ چوومە کونگرەی رۆژنامەگەری لیژنەی بالای هاریکاری چەپە کوردستانیەکان. خەلکێکی زۆر بەشداری کرد بوو.لە

کۆبوونەوەدا لە سەر هەموو مەسەلەو گیرو گرفتی کوردستان و رووداوەکانی نەتەوەیی و نێو نەتەوەیی باس و وتو وێژ کرا. وەک : بەرەی کوردستانی، پارلمان، حکومەت، برسیەتی، بێکاری، ئاسایش، بارو دۆخی نێو نەتەوەیی، سیاسەتی دەولەتانی زلهێز، مەسەلەی یەکێتیەکانی پیشەیی و دەوریان لە بردنە پێشی کۆمەلدا، مەسەلەی چەپ لە کوردستان و مافی مرۆڤ و هەلوێستی حکومەتانی دراوسێ و مەسەلەی کوردستانی گەورەو .... بە تێر و تەسەلی وەلامی رۆژنامە نووس و دانیشتوانی کۆبوونەوە دەدرایەوە.

پرسیاری ماموستا سەعید ناکامم کرد، گوتیان لە شەقلاوەیە و بارودۆخی ژیانیشی تەواو نیە. بریارم دا بچم سەری بدەم. رۆژی ١١/٢. کە لە سەلاح‌الدین لە گەل کاک مەسعود وادەم هەبوو، دەرفەتێکی باشبوو کە بچمە سەر دانی ماموستا سەعید ناکامیش. تەلیفونم کرد بۆ ماموستا گۆران، ماشێن و سێ پێشمەرگەی نارد و چووینە شەقلاوە مالی ماموستامان دیتەوە. کە چوومە ژوورێ بە تەنیا دانیشتبوو. هەستم کرد بە دیتنم گەشایەوە، بەلام من لە داخی رەفتاری چەرخی کەچ رەفتار فرە نارەحەت بووم. چەند جار لە سەر یەک گوتی : « ئەی.. چۆن ؟ ئەوە کاک کەریم و لە شەقلاوە بێ سەری من بدات ؟ خۆ خەون نیە .. »

دەستی کرد بە پرسیاران لە چوار چێوەی ئەم مەسەلەیەدا کە ئە سەرەتای هەرزە کاریەوە لە ناخ و مێشکی دا دەجولێ و ئازاری دەدا، واتە (رزگاری و سەر بەخۆیی و یەکگرتنەوەی کوردستانی گەورە)، لە چالاکی روناکبیرانی کورد لە دەرەوە، لە تێکۆشانی حیزبە سیاسیەکانی رۆژهەلاتی کوردستان و بواری روشنبیری پرسیاری کرد و

بیرورای منی دەپرسی. پرسیاری سمکۆ وپشکۆی کوری کرد. باسی لە بەینچوونی بە شێکی زۆری نووسراوەی بیرەوەریەکانی کرد و گوتی : جارێکی تر نووسیومنەوە بەلاّم هیچ دەرەتانی چاپ و بلاّو کردنەوەیان نیە. بە ئاوات و تاسە بوو کە چاوی بە بیرەوەریەکانی من بکەوێ. رەسمێکم لێ هەڵگرت و رەسمێکم لە گەڵ گرت و دیاریەکی فرە پچووک و متواضعانەم پێشکێش کرد. مالاّوایم لێ خواست، چونکە وادەی چوونی لای کاک مەسعود نیزیک دەبۆوە.

گەراینەوە بۆ سەلاحالدین. ئەو رۆژە بۆ لێکۆڵینەوەو پێشنیار و بیرو راگۆرینەوە لە سەر فیلمێک کە بریارە لە سەر ژیان و خەبات و رابردووی سەرۆک بارزانی نەمر ساز بکرێ، کۆبوونەوەیەک لە هونەرمەند و نووسەرانی کورد پێک هاتبوو. بە خۆشیەوە منیشیان داوەت کرد کە تا هاتنی وادەکەم بەشداری بکەم . گوێم بۆ بیراو راو پێشنیارەکان راگرت. پرۆژەیەکی گەورە و پیرۆزە ئەگەر بتوانن بە بەشداری هونەرمەندان و کار گەردانی بە ناو بانگی جیهانی سینەما ئامادەی بکەن، بە راستی ناوی کورد و کوردستان دەکەوێتە سەر شاشەی تەلەڤیزیون و پەردەی سینەمای جیهان و گەورە ترین هەنگاو دبێ لە بواری کولتوریدا بۆ ناساندني گەلي کورد و رێبەرەکەی بە گەلانی جیهان.

کۆ بوونەوە تەواو نەببوو بانگیان کردم. کاک مەسعود لە بەر دەرگای هۆدەکەی پێشوازی کرد و بە گەرمی بەخێر هاتنی کردم. دانیشتین پێکەنی گوتی : جارێک مەسەلەی ئیرەجی ئەسکەندەرێت بۆ گێراومەوە کە هەر لە تەیارە دێتەخوار و کابرای میواندار لیی دەپرسێ کەی دە گەرێیەوە! منیش ناوێرم پێت بڵێم چەند لێرە دەبی.

ئیره مالی خۆته»

گوتم بلیتی مانگێکم هەیە. پێویست بوو بۆ پیرۆز بایی لەم دەسکەوتە گەورە زووتر بێم، بەلاّم مەسەلەی پاسپۆرت وڤیزا بوونە تەگەرە. بەر لە هەموو شت راسپاردەی برادەرانی زاخۆم پێگوت. زۆر نارەحەت بوو. بانگی کرد گوتی هەر ئێستا بە وەزیری صناعە بێژە چەند رۆژە من گوتومە فیکری ئاوی زاخۆ بکەن.

پاشان گوتی:« سەری برادەرانی پێشووت نادەی؟»

- بە تەما نیم. هیچ پێوەندیم لە گەڵیان نیە. ئەوان هاتوونە سوید سەری منیان نەداوە، من بچم بلێم چی. ئەوان ئێستاش لە دنیای خەیاڵ و رێبەرایەتیدا دەژین.

باسی بارودۆخی رۆژ هەلاّتی کوردستان و دەرفەتی لە کیس چوومان کرد. کاک مەسعود سیاسەتی دەولەتە گەورەکان و بارودۆخی کوردستانی باسکرد و قسەکانی بۆ من نرخی زۆریان هەبوو. پاشان لە گەڵ روونکردنەوەی ناتەواوی و کەمو کوریەکان گوتی:« ئێمە بە سەر ولاّتێکی وێران و خاپور و گەلێکی دوا کەوتوودا کەوتین. هیچ نەمابوو. دەرکەوت کە گەلەکەمان لە وێرانکردندا پتر دەستی هەیە نەک لە ئاوەدان کردنەوەدا. باسی (p.k.k.) کردو گوتی « دوێنێ ۳ پێشمەرگەی ئێمەیان شەهید کردوەو ۱۲کەسیشیان لە گەڵ خۆ بردوە. بە ئانقەست شەریان خستۆتە سنووری ئێمە و شەرمان پێ دەفرۆشن. ئێران وعیراق هانیان دەدەن کە ئێمە تووشی شەر بکەن و کێشەمان بۆ ساز بێ. ئەوان دەتوانن لە ناوچەکانی دوور لە سنووری ئێمە شەر بکەن»

گوتم : « ناکۆکی نێوان حکومەتی کوردستان و پارتی کرێکارانی

کوردستان بۆ کورد دەبێتە کارە سات. پێویستە بە سەبرو بە زانایی چاری بکرێ. لام وایە دەبێ ئەوان ئەوەندە بزانن کە لە کردەوەی ئەوان دوژمن کەلک وەر دەگرێ و پێویستە بەرژەوەندی حکومەت و پارلمانی کوردستان بپارێزن.»

کاک مەسعودیش وەک مام جەلال کەمو کوری و ناتەواوی و پەیدا بوونی هێندێ ناکۆکی باسکرد و لە سەر بەردەوامی یەکێتی و درێژەی دانیشتن و وتووێژی دۆستانە پێی داگرت. شتێکی لە چاو پێکەوتنی کاک مەسعود و مام جەلال منی بە دوارۆژ خۆشبین کرد، دان پێداهێنانی هەر تکیان بە ناتەواوی و هەوڵدان بۆ چارە سەر کردنی ناکۆکی و گیرو گرفتەکان بوو. لە گەڵ کاک مەسعود نانمان خوارد و باسی گەلێک مەسەلەی ترمان کرد. دوای نانخواردن ئیزنم لێ خواست و گەرامەوە بۆ هەولێر. کە هاتمەوە ئەم نامەی خوارەوەم بۆ هاتبوو:

« هەولێر/١٨/١١/١٩٩٣

زیدە بەرێزو خۆشەویستمان ماموستا کەریمی حسامی - سلاوێکی گەرم. هیوا دارین هەمیشە شادو سەر کەو توو بن. ماموستای بە رێز، بۆ ئەوەی ئەدیب و روناکبیرانی کورد لە نیزیکەوە بتانناسن و سود لە بیرو راو ئەزموونی سیاسی و فیکریتان وەر بگرن، وامان بە باش زانی کۆرێکی تایبەتیتان لە کافیتێریای ( کوردستانی نوێ) بۆ ساز بکەین. دیارە کۆرەکەش بۆ چەند ئەدیبو رۆشنبیرێکی ناسراو و دەست نیشان کراو دەبێت.

کۆرەکە بۆ تەلەڤیزیون تۆمار دەکرێت و وەک ئەرشیفیش لای TV دەمێنێتەوە. هیوا دارین رەزامەندی بفەرموون و ئاگادارمان بکەنەوە،

چونکە ئیمە رۆژی یەکشەمۆی داهاتوو رێکەوتی ١٩٩٣/١١/٢١ مان بۆ کۆرەکە تەرخان کردوە سەعات ٣ی دوای نیوەرۆ. لە گەڵ جوانترین رێزماندا، هەر بژین.

براتان سعداللە پەرۆش سەرکی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر.

براتان فەرید زامدار بە رێوە بەری TV گەلی کوردستان، کاناڵی هەولێر.»

رۆژی یەکشەمۆ میوانی ماڵی کاک عبدالقادر و کاک عبدالرحمانی نەقشبەندی دۆست و برادەری قەدیمی بووین، لە قسەی خۆش و یادی رابردو وباسی جیهان و کوردستان تێر نەبووم، دەبوایە سەعاتی ٣ بچمە کۆری برادەرانی کوردستانی نوێ. لام وایە کۆرەکە دوو سەعاتی خایاند. بۆ تەلەڤیزیون تۆمار کرا. برادەرانی بەشدار لە پرسیار و دەر برینی بیرو راو لێکدانەوەی مەسەلەکانی رۆژ، بە شێلگیری بەشداریان کرد. کۆرێکی زیندوو، دۆستانەو کەش و هەوایەکی کوردانەو برایانە بوو. چەند رەسمێکمان بۆ یادگار گرت. قەرار بوو نوسخەیەکی فیلمی تۆمار کراوی تەلەڤیزیۆن بۆ یادگار بدەنەوە بەخۆم. تا ١٢/١ هیچ خەبەری نەبوو. بەڵام درەنگتر بەرێز کاک فەرید زامدار فیلمەکەی لە گەڵ نامەیەکی شیرینی دۆستانە بە دوکتور جەمشید دا بۆ نارد بوومەوە ،سوپاسیان دەکەم.. جا ئێستا کە هەموو شت دەنووسم، بۆ چی ئەم رەخنەیەش باس نەکەم کە لە کۆرەکەدا دەرم بری. ئەوە بوو کە لە کۆرێکی نووسەران و رووناکبیرانی هەولێردا، لە بارودۆخی ئیمرۆی کوردستاندا، یەک خوشکی رووناکبیر و خوێندەوار بەشدار نەبێ. تۆ بڵێی کوردستان و هەولێر لە ئێریتێریا و بنگلادێژیش دوا

کەوتوو تر بن. نازانم رەخنەکەی منیان چۆن لێکدایەوە، بەلاّم قەولیان دا، لەکۆڕێکی دیکە دا( ئینشائەلا) خوشکی ڕووناکبیریش بەشداری بکەن.

ئێواریٰ کاک عبدالقادری فەرهادی لە لایەن رۆژنامەی کوردستانی نوێ -وە بۆ وتووێژێکی چاپەمەنی هات که لە ژمارەی ١٩٩٣/١١/٢٦ دەقی وتو وێژەکە بلاٌو کراوەتەوە .

رۆژی ١٩٩٣/١١/٢٢ کاک سەرۆ قادر و کاک ئاسۆ کەریم لە لایەن رۆژنامەی برایەتیەوە هاتن وتو وێژی چاپەمەنیان کرد. پرسیار و وەلاٌمەکان وەک لە ژمارە ٢٥ و ١٩٩٣/١١/٢٦ ی رۆژنامەی برایەتی دیارە شێوەی باس و پرسێکی دۆستانەیان هەبوو. بەلاّم بە داخەوە ئەوەندەی هەلّەی چاپی تێدایە، هێندیٰ جار لە خۆم وەشک دەکەوم کە بلٌێی من ئاوام قسە کرد بیٰ؟.

## سەفەر بۆ سولەیمانی.

رۆژی ١١/٢٤ بەرێز مام جەلال ماشێن و دوو پێشمەرگەی ناردن و لە گەلٰ کاک مومتاز حەیدەری چووینە سولەیمانی و میوانی مەلٌبەندی سەر کردایەتی یەکێتی نیشتمانی بووین. دیار بوو مام جەلال نامەی بۆ کاک عومەر سەید عەلی نووسیبوو. دوو رۆژ لە سولەیمانی بووم. کاک یوسفی ریزوانیم دیتەوە کە چوونی سولەیمانیم تایبەت سەردانی ئەو بوو. سەری ماموستا کەریم زەندیم دا و چەند برادەر و ئاسیاری دیکەم دیتن.

تەلەڤیزیونی پارتی دیموکرات و تەلەڤیزیونی حیزبی کومونیستی کوردستانیش وتوو ویژنکیان لە گەڵ کردم و وەڵامی پرسیارەکانم دایەوە. ئەوانیش هەر تک قەولیاندا کە نوسخەیەکی فیلمەکەم بۆ بنێرنەوە. بەڵام بە داخەوە تا من لەوێ بووم نەیاننارددەوە. هیوا دارم قەولەکەیان وەراست گەڕێ و ئەم دوو کاسێتەشم پێ بگەنەوە.

رۆژی ٢٦/١١/دەبوایە بگەڕێمەوە، چونکە دوو برادەرم لە ئێرانەوە دەهاتن. کە چووینە مەڵبەند تا ماڵاوایی لە کاک عومەر بخوازین، کاک عومەر سەید عەلی و ملازم عومەر و کاک مستەفا چاو رەش و کاک سالار و مام روستەم و برادەرانیتر دەهاتنە دەر و گوتیان ئەوە دەهاتینە لای تۆ. نابی برۆی ، ئێمشەومان بۆ دانیشتن و باس و قسەی خۆمانی داناوە. بریارم دابوو بگەڕێمەوە . بە دنیایەک سوپاسەوە لە هەستی برایەتی و میهرەبانی و میوانداریان ئیزنم خواست و کەوتینە رێ و ئێوارێ گەیشتینەوە هەولێر و لە کاک جەلال و کاک دارا، دوو پێشمەرگەی جوامێر و خاوەن زەبت و رەبت و نیشتمان پەروەری مام جەلالیش جیا بوومەوە و سوپاسی هەموو لایەکیان دەکەم. ناتوانم پەژارەی خۆم لەوەش دەر نەبرم کە نەمتوانی ماموستا بهاالدین نوری ببینم و بۆم بۆتە فیکر و خەفەت خوا بکا بە کەم ئیرادەتی لە سەرم تۆمار نەکات. بە داخەوە بە خزمەت ماموستا کەریم ئەحمەدیش نەگەیشتم.

# جارێکی تر لە هەولێر

خەبەرم زانی بە خۆشیەوە کاک عەزیز محەمەد گەراوەتە. بە لاَم نەک هەر لە سەفەر گەراوەتەوە، بەڵکوو رۆژی ۱۱/۲۷/ بە هاتنە لام سەر فراز و شادی کردم. ئەو کە هەمیشە پێو قەدەمی بە خێر بوە، ئەمجارەش هەر بە دوای هاتنی ئەودا، دوو کیژی هەولێری( لام وایە ئەم زاراوەیە بۆ جوانی کچ بەس بێ ) لە لایەن رۆژنامەی رێگای کوردستانەوە بۆ وتو وێژێک هاتنە لام و هێندێ پرسیار و وەلاَمیان تۆمار کرد و رەسمیان گرت. وتوو وێژەکە لە ژمارە ( ۱۹۹۳/۱۲/۷) رۆژنامەی رێگای کوردستان دا، چاپکراوە.

کاک عەزیز کە قەت خەسڵەتی کوردانەی دانەناوە، بۆ رۆژی چوار شەمۆ ۹۹۳/۱۲/۱ بۆ فراوین داوەتی کردین بە برادەرانی ئەو دیویشەوە. باشە.. خۆ ئەو ماڵی لە هەولێر نیە ، لە کوێمان داوەت دەکا؟

ئەو قسانە چن؟ ئەدی هەموو رۆژ رۆژی دەخودای نین و هەموو ماڵیش ماڵی کاک عەزیز محەمەدی ؟

تا رۆژی چوار شەمۆ خەریکی وەلاَمدانەوەی پرسیارەکانی پەیامنێری رۆژنامەی ئالاَی ئازادی بووم. وتو وێژەکە لە ژمارە ( . . ۱ ) ی (۱۹۹۳/۱۲/۵ ی رۆژنامەی ئالاَی ئازادی ئۆرگانی حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان دا بلاَو کراوەتەوە.

بێجگە لە رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تەلەڤیزیۆنی حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستانیش وتوو ویژی لە گەڵ کردم و بە خۆشیەوە ئەوان بەڵێنی خۆیان بردە سەر و نوسخەیەکی فیلمی وتو ویژەکەیان بۆ هێنامەوە.

رۆژی ۹۳/۱۱/۲۷ میوانی ماموستا مەلا عەولای حاجی سمایلی بووین. دیدارێکی فرە خۆش و دۆستانە بوو. باسی نووسین و ئەدەب و زمان و یادی رۆژەکانی رابردوو، هیچمان تێدا نەهێشتەوە. مرۆ لە دانیشتنی کن پیاوی ئاوا تێر نابێ، بەڵام وادەی دیدار و میوانی و چاو پێکەوتنی دۆست و برادەران ئەوەندە زۆر بوون، وێرا نەدەگەیشتم کە تێرو پڕ لە لای برادەرێکی ئاوا دادەکنیم. ناچار دوای فراوین ماڵاواییمان لێ خواست.

دوای گەرانەوەم لە سولەیمانی تەلەفونم بۆ مام جەلال کرد کە سوپاسی میوانداری و هەڵوێستی برایانەی بکەم و بزانم کەنگێ وەک وادەی دابوو دەتوانم بە خزمەتی بگەم. تەلەفوونی منی وەر گرت و گوتی خۆم تەلەفونت بۆ دەکەم . بەڵام دوایە بەسەفەر چوو، ئیتر لە چاوپێکەوتنی دوو بارەی بێ بەشبووم.

رۆژی ۱۹۹۳/۱۲/۱ میوانی هاورێی بەرێز کاک عەزیز محەمەد بووین. خوای تەعالا بیپارێزێ، نەک هەر میوانداری، بەڵکو رێگای دووریشی بۆ نیزیک کرد بوومەوە. من بریارم دابوو بۆ سەر دانی برادەرانی حیزبی کومونیستی عیراق و پیرۆز بایی لە هاورێ حەمید بە بۆنەی هەڵبژاردنی بە سکرتێری حیزب، بچمە شەقلاوە. بەڵام کاک عەزیز وایکرد بوو کە هاورێ حەمید بێتە هەولێر و بەشداری میوانداریەکە بێ. دانیشتنێکی کەلێک بە پێز و بەکەلک و بە تام بوو. سوپاسیهەموو لایەکیان دەکەم.

ئێوارەی ئەو رۆژە چوومە سەر دانی حیزبی پارێزگارانی کوردستان.
لە دانیشتنێکی کورت و گەرمودۆستانەدا، لە گەڵ کاک نەجمی کوری عومەراغاو دوو ئەندامی رێبەرایەتی باسی بارو دۆخی کوردستانمان کرد. ئەوان بە

درێژی باسی سیاسەت و پێرەو وپرۆگرامی حیزبی خۆیا ن کرد.
حیزبی پارێزگاران سەربەخۆیی ویلایەتی موصلی کردۆتە بناخەی سیاسەت و تێکۆشانی خۆی. لە برۆگرامی حیزبدا کە بە عەرەبی نووسراوە، سەر بە خۆیی و مافی ئینسان و دێموکرسیی‌یان بە ئامانجی حیزب داناوە. لە بارەگای حیزب نەخشەی ویلایەتی موصل و مێژووی راپەرین و شۆرشەکانی کوردیان لە تابلۆدا هەڵاوەسیوە.

یەکێتی نووسەرانی کوردستان پێکهێنانی کۆرێکی ئەدەبی و سیاسیان بۆ رۆژی شەمۆ لە بەر چاو گرتبوو، بەڵام کاک خەلیلی هاو سەفەرم لە سەر گەرانەوە سێ رۆژ پێش ماوەی بلێتی تەیارە پێی داگرت و بە ناچاری دەبوایە

واز لە هێندێ وادەو دیداری دۆستانە بێنم و بکەومە رێ. نەتیجەی پەلەی کاک خەلیلیش ئەوە بوو، لە جیاتی ئەوەی سێ رۆژ لە کوردستان بمێنینەوە، هاتین سێ روز لە تورکیا ماینەوە و تۆزۆشی خەرجێکی زیادی و بێهودە بووین.

ئێستا کە ناچار بووم پێش وادە کوردستان بە جێ بێڵم، دەمەوێ پر بەدڵ سوپاسی ئەو رووناکبیر و سیاسی و نووسەرە نیشتمانپەروەرانە بکەم کە بە هاتنە لام سەر فرازیان کردووم. سوپاسی ئەم نووسەر و برادەرانە بکەم کە کتێبی بە نرخیان پێشکێش کردووم. سوپاسی ئەو رۆژ نامە نووس و پەیامنێر و کار گێری تەلەڤیزیونانە بکەم کە

وتویژیان لە گەڵ کردووم. سوپاسی ئەو برادەر و ماڵ و خێزانانە بکەم کە بۆ بانگێشتن و میوانداری زەحمەتیان کێشاوە. سوپاسی بێ پایانی خۆم پێشکێشی خەڵکی بە شەرەف و کۆڵنەدەری کوردستان و حیزب
هێزە شۆرشگێرەکانی کورد بکەم کە بە خەبات و فیدا کاری هەل و مەرجێکی ئەو تۆیان پێک هێناو، کە بتوانم پاش دەیان ساڵ ئاوارەیی بێمەوە نیشتمان و بە دیداری کوردستان و دۆست و برادەران شاد بمەوە.

رۆژی ١٩٩٣/١٢/٢ بەیانی کاک فارس باوە هات، پێشنیاری کرد کە هەتا زاخۆ لەگەڵم بێت، دیارە لە گەڵ سۆپاس نەدەکرا ئەوان زەحمەت بدەم. پاشان بەرێز کاک قادر عەزیز سکرتێری حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان هات و تا سوار بوونی تاکسی لە لام بوو. لە سوپاسێکی خالیسانە بەدەر چیترم لە دەست نایە و هیچ شتێکیش قەرەبۆی جوامێری و هەستی برایەتی ئەم خەڵکە ناکاتەوە، ئەوە ئەبێ هەر وەک رابردوو بە رێبازی کوردایەتی رەسەن و رزگاری کوردستان و بە خێرو خۆشی زەحمەتکێشانی کورد و بە رێبازی داد پەروەری کۆمەلایەتی وەفادار بمێنم .

رۆژی ١٢/٢/ سەعاتی ١١ تاکسیمان گرت و شەو جووین لە دهۆک ماینەوە. بەیانی چووینە زاخۆ کاک محەمەد سلیواني و سەر بەست زاخۆلي وەرەقەی تێپەر بوونیان واژۆ کرد. من مەسەلەی حاجی شۆفیر و وەر گرتنی ١.٥ دۆلارم باسکرد و داوام کرد کە بێهێنن تا بزانین دەستی گومرگ لەو رێکریەدا هەیە، یا کابرا رێگریش دەکا و بوختانیش هەڵدەبەستێ. ناردیان حاجی بدۆزنەوە لەوێ نەبوو. رایان ئەسپاردە سەیتەرە کە پەیدا بوو بیگرن. کاک سەر بەست گوتی:«

حاجی دە دۆزینەوە، پارەکەی لیَ دەستینینەوە و بە خێری تۆ دەیدەین بە فەقیران.»

گوتم : ئەوە، مانای وایە هیچ و شتەکە پوش بە سەر دەکریَ. من دەمەویَ ئەگەر کابرا درۆی کردوە، بە توندی سزا بدریَ. پارەکەی لیَ بستیننەوە و بۆ منی بنێرنەوە. تا بزانم کە کار بەدەستی گومرک لە گەلْی شەریک نین وەک دەیگوت و کابرا بوختانی بە مەعمورانی حکومەت کردوە. دیارە من نەمدەتوانی چاوەروانی هێنانی حاجی بم، ناچار مالاْواییمان خواست و کاک سەر بەست بە شۆفیرێکی ئەسپاردین کە ..۱ دۆلاْرمان زیاتر لیَ نەستێنیَ و بمانگەیێنێتە دیار بەکر.!!

خوارووی کوردستانمان بە جیَ هێشت. سەرەرای لە بیر نەچوونی خۆشی ئەم سەفەرە، ناتوانم پەرۆشی خۆم لە سیَ خالْی کەم و کوری رانەگەیێنم :

- لە سولەیمانی نەمتوانی سەری کاک بەهائەددین نوری بدەم. سەبارەت بە هاتنی برادەرانم لە ئێرانەوە نەکرا پتر لە سولەیمانی بمێنمەوە.

- بە رێز ماموستا هادی چاوەشلی لە رادە بەدەر ئیسراری کرد کە رۆژی پێنجشەمۆ ۱۲/۲/ میوانی بم، بە داخەوە نەکرا چەند سەعاتێک لە بۆ چوون و بیرو راکانی ماموستا کەلک وەر گرم.

- پێرا نەگەیشتم لە کۆری روشنبیریی یەکێتی نوسەرانی کورد بەشدار بم و لە ئەزموون و بۆ چوون و بیرورای ماموستایانی نووسەر و ئەدیب و رۆشنبیر گەلک وەر گرم .

بەشی دووەم

# لە خوارووی کوردستان چ باسە؟

پرسیارێکی رەوایە. کەسێکی باسی سەفەری خۆی بۆ کوردستان دەگێڕێتەوە، دەبێ هێندێ لە رووداوەکان و چۆنیەتی ژیانی خەڵک و باری ئاسایش و سیاسی و دیتنەکانی خۆشی باس بکات، جا با بە کەم و کوریش بێ.

بەر لەوەی بێمە سەر باسکردنی ئەم بەشەی نووسینەکەم، با گۆتەیەی یەکێ لە زانایانی فەلسەفە وەبیر خەمەوە کە دەڵێ :

« وشەو زاراوی راست و بابەت ( واقیعی) جوان نین، وشەو زاراوی جوانیش راست و بابەتی( واقیعی) نین. »

رەنگە ئەمە شتێک بێ هەر وەک ئەم پەندەی کوردی کە دەڵێ:« قسەی هەق رەقە -- یا تاڵە . »

لە خوارووی کوردستان چەند دیاردەی لێک جیاواز و تەنانەت ناتەباش دەبینرێن. شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی بابەتی ئەم چەند دیاردەیە هەر وا هاسان نیە و لە نووسینێکی ئاوا کورت و سەر پێیدا ناگونجێ.

ئەوەی بەر لە هەموو شت کوردێک بە دیداری کوردستان شاد دەکا، بریتی‌یە لە دەسەڵاتی نەتەوەیی کورد، لە خوارووی کوردستان بە سەر بەشێکی نیشتمانی دابەشکراودا. ئەمە دەسکەوتێکی مەزنی نەتەوەییە و جێگای شانازی گەلی کوردە و هەر چەندی لە سەری

بنووسرێ کەمە و هەڵدەگرێ.

دوای راپەرینی مێژوویی خەڵک و پاشەکشەی بوش سەر کۆماری پێشووی ئەمریکا لە سەر کوتکردنی سەددام، رژێمی رەفتار ڤاشیستی بەعس، سەرە رای شکانی بێ ئابروانە، نەیتوانی واز لە کردەوەی درندانەی خۆی بێنێ، بە هەموو تواناو چەکێکی هێزەکانی هاو پەیمان بۆیان هێشتبۆوە، کوردستانی پەلامار داو بوو بە هۆی کۆرەوی مێژوویی کوردەکان کە لە دنیا دەنگی دایەوەو حکومەتی ئەمریکا نەیتوانی لە بەرانبەر رەخنەو گوشاری بیرو رای گشتی نێو نەتەوەیی خۆ مات بکا، لە جیاتی روخاندنی سەددام، مەسەلەی چەتری ئەمنیەت و هێڵی ٣٦ی هێنا گۆرێ و خوارووی کوردستانی لە پەلاماری نوێی ئەرتەشی سەددام پارێزرا.

## راپەرینی خەڵک

راپەرینی قارەمانانەی کۆمەلانی خەڵک لە خوارووی کوردستان لێکدانەوەی زانستی و شیکردنەوەی هۆکار و ئاکامەکانی گەلێک پێویستە و لەم کورتە نووسینەدا جێنا گرێ. بەلأم دەمەوێ بەکورتی لە سەر سێ خالی بەر چاو بە کورتی بیرو رای خۆم دەر ببرم :

١ - راپەرینی بەهاری ١٩٩٠ی گەلی کورد لە خوارووی کوردستان ، لە بواری جۆشدانی قین و بیزاری خەڵک لە دەسەلأتی شوومی بەعس بێ وێنە بوو. نەک هەر بوو بە هۆی رامالێنی دامو دەزگای رەشی حکومەتی ڤاشیستیو سزاداتی جنایەتکارانی خوێن

ڕێژ، بەڵکوو بە هۆی دەرخستن و لە قاودانی ئەو هەموو جنایەت و پیاو کوژیەی کە حکومەتی سەددام لە کوردستان کردوویەتی. بوو بە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی بیروڕای گشتی لە ئورووپا و دەوڵەتە مەزنەکانی ناچار کرد کە هەڵوێست بگرن.

٢ - لە بەر ئەوەی ڕاپەڕین ـ لایەن حیزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانەوە نەخشەی بۆ دانەڕژا بوو، لە ڕێنوێنی و ڕێبەرایەتی و زەبت و ڕەبتی شۆڕشگێڕانە بێ بەشبوو، لە پاڵ هەنگاوی دلێرانەی نەتەوەییدا، تووشی هێندێ دیادەو کردەوەی دزێو ونالەباریش بوو، کە لە ڕاپەڕین و شۆڕشە ڕزگاریخوازەکاندا نەبینراوە. وەک : وێرانکردنی بنکەو بنیاتە ئابووری و کولتوری و کۆمەلایەتیەکانی وڵات، دزین و ڕفاندن و ئاوا کردنی دار ونەداری کوردستان. وادیارە ڕاپەڕیوەکان و یا هەر چی دەستی لە دزی و بردن و ئاوا کردن دا هەبوە، بە هیوای ئەوە نەبوە کە لە کوردستان دەمێنێتەوە و پێویستە ئەم نیشتمانە ئاوەدان بکرێتەوە و ئەم بنکە و بنیات و ئامراز و کەل و پەلە ، ملکی کوردن و دەبێ لە کوردستان بخرێنە گەڕ. ڕاپەڕینیان بۆ دزی و تالانی بنکە دەوڵەتیەکان بە دەرفەت زانیوە. جێگای داخ و مەخابن ئەوەیە کە بە شی زۆری حیزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانیش بە حوکمە شوێن و دەسەلات لەو تالان و ئاوا کردنەدا، دەستی خەڵکی ڕەش و ڕووتیان لە پشتەوە بەستوە.

٣ - ڕاپەڕین بوو بە هۆی گەڕانەوەی هێزە سیاسیەکانی کوردستان بۆ وەرگرتنی دەسەلات و بەرەی کوردستانی توانی تا ماوەیەکی زۆر لە باری ئاسایش و ڕاپەڕاندنی کارو بار و سەقامگرتوویی بارو دۆخی وڵات دەورێکی گرنگی هەبێ و ڕێبەرایەتی بکات. تا هەڵبژاردنی

پارلمان ر دامەزرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەرەی کوردستانی ناونک و قەوارەیەکی هەر مابوو. لە دابینکردنی ئاسایش و پێشگری لە شەر وکێشە و ئاژاوەی نێو خۆ دەورێکی بەر چاوی هەبوو. لەو باوەرەدام ئەگەر پێش شەری خەلیج بەرەی کوردستانی نەبایە، ئێستا کوردستان گۆرستانی خەڵکی کورد دەبوو. بە هەڵبژاردنی پارلمان و دامەزرانی حکومەتی کوردستان، ئیتر بەرەی کوردستانی هیچ دەوری نامێنێ و ئەمەش بە بۆ چوونی من یەک لە خاڵە نیگاتیڤەکانی بارو دۆخی ئیمرۆی خوارووی کوردستانە.

## هەڵبژاردن و پارلمانی کوردستان

هەڵبژاردنی پارلمانی کوردستان، بە شێوەیەکی ئازاد و قانوونی و دیموکراتی، کەسایەتی نەتەوەی کوردی بە دنیا نیشان دا. پارلمانی کوردستان هێندێ هەنگاوی گرنگی هاویشتن وەک : دامەزراندنی ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستانی عیراق، داتانی یاسای جۆر بە جۆر کە پێوەندی‌یان هەیە بە ئاسایش و ئاوەدانکردنەوەو دامەزراندنی بنکەو بنیاتە حکومەتیەکان و لە وانەش گرنگتر راگەیاندنی سیستمی فیدراڵی کە ویستێکی رەواو دنیا پەسند و خواستی گەلی کوردە لەم بەشەی کوردستاندا. بەلاَم ناکرێ ئەم واقعیەتە تاڵەش باس نەکرێ کە دابەشبوونی هێز و دەسەلاَت لە نێوان دوو حیزبی سەرەکی‌دا، بۆتە هۆی گیرو گرفتی تازەو نارەزایی خەلک و رانەپەراندنی پرۆگرامەکانی حکومەتی و سەر هەڵدانی هێندی ناکۆکی سیاسی و کۆمەلاَیەتی. ئەو

منافەسەو مل ملانیەی کە ئیمر لە نێو دەزگاکانی دەوڵەتی هەرێم و بنیاتە کولتوری و کۆمەلایەتی و ئابووریەکانی خوارووی کوردستاندا دەبینریٰ، رەش بینی نیە کە بلێم بۆ سەر کەیان و ئەزموون و قەوارەی دەسەلاتی نەتەوایەتی مەترسی هەیە..

لە زۆر شوێن، لە گەلێک بنکەی روشنبیری و ئیداری سەبارەت بە مونافەسەی حیزبایەتی کار وستاوە. بە سەدان کەسی نیشتمان پەروەری لێهاتووی زیندان و جەزرەبە دیتوو، تەنیا بە تاوانی بیٰ لایەنی لە نێوان دوو حیزبی سەرەکی، بێکار و برسی و خانە نشین سەیری رووداوەکان دەکەن. لە بەرانبەر ئەوەدا سەدان کەسی ئەوتۆ کە هەمیشە لە مەیدانی خەبات دوور بوون و رۆژێک لە رۆژان لە سەر خەبات و مەسەلەی میللی ئازار و دژواریان نەچێشتوە، هەلسور و قەڵەم بە دەستیٰ دەورانی حکومەتی رەشی بەعس بوون و تەنانەت هاوکاری رێژێمیشیان کردوە، خۆیان خزاندۆتە بن باڵی حیزبە سەرە کیەکان و لە پارلمان و دەزگای حکومەتی و حیزبی و ئیداریدا جێگای خۆیان کردۆتەوەو گاڵتە بە چارە نووسی نیشتمانپەروەرانی تێکۆشەر و ماڵوێرانی دەستی بەعس دەکەن.

شەوی ۹۹۳/۱۲/۱۸ کاتیٰ ئەم وشە تاڵ و ژاراویانەم دەنووسی، گوێم دابوە موناقەشەیەکی رادیۆیی لە رادیۆی سپۆنگا لە ستوکهۆلم. نوێنەرانی پارتی دێموکراتی - یەکگرتو و یەکێتی نیشتمانی وەلامی پرسیارەکانیان دەدایەوە. پرسیاری دوو کەسیان لە کاک ئیمام کرد کە گۆیا لە دەورانی بەعس دا، جاش بوون، خەڵکیان کوشتوە، خەڵکیان بە گرتن داوە، دەستیان لە ئەنفالدا هەبوە، لە تالان و دەست درێژی بە ناموس و گیان و ماڵی خەڵک دەستیان نەگێراوەتەوە، ئێستاش

هاتوون له ریزی یەک لەو حیزبانەدا جێگای خۆیان کردۆتەوە.
کاک ئیمام له وەلامدا گوتی : راستە. بەلام ئەوانیش کوردن، ئەوانیش خزمەت دەکەن، دەبێ چاو پۆشی هەبێ. »
قەلەمەکەم راگرت. چوومە نێو دەریای بیرو خەیالاتی خەفەتاوی. بەلێ ... کاتی بەعسی بوون و کوردیان دەکوشت، کورد بوون، ئێستاش هاتوونەوە کوردستان و بەو شەرتەی لە گەلٚ یەک لەو دوو حیزبانە بن، دیسان کوردن. ئەگەر وەرەق وەر گەراو دەستیان کردەوە بە کوشتاری ئازادیخوازان، دیسان کوردن. نازانم ئەم وشە پیرۆز و رەسەنە لە کۆمەلی کوردەواریدا تا کەی شەپ شەپێنی پێدەکرێ و خەلکی پێ فریو دەدرێ.!!

## ناتەبایی لە رەوەندی پتەو کردنی دەسەلاتی نەتەوەییدا.

لام وانیە پتەو کردنی دەسەلاتی نەتەوەیی لەوە دابێ کە بەر پرسەکانی حیزبی چەند پێشمەرگەیان لە کاتی گەران بە نێو شاردا بە دواوە بێ. یا سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران کاتی چوە هوتێلێک ۳=٤ ماشێن پێشمەرگەی لە پاش و پێش برۆن. لە کۆمەلی ئیمرۆی کوردەواریدا، ئەمە تا رادەیەک بۆ پارێزگاری پێویستە، بەلام نەک بگاتە شوو لێ هەلکێشان و خۆ نواندن لە سەر کۆمەلێکی فەقیرو برسی و لێقەوماو.
پتەو بوونی دەسەلاتی نەتەوەیی کورد، لە پشتگیری کۆمەلانی

هەراوی خەڵکدا دەبینم. ئەم دەسەڵاتەی ئێستا لە خوارووي کوردستان هاتۆتە دەست، ئەگەر هۆکاری دەرەکی لێ جیا کەینەوە، بەرهەمی راپەرین و فیداکاری و قوربانیدانی زەحمەتکێشانی کوردستانە. بەڵام ئێستا لە چوار چێوەی دوو حیزبی سەرەکی دا قەتیس کراوە. خەڵک بە ئاشکرا هەست بەم ناتەباییە دەکات.

راستە ئەم دوو حیزبە لە هەڵبژاردنی پارلمانیدا زۆربەی دەنگیان وەدەست هێناوە، بەڵام لام وایە بەرژەوەندی گشتی ئیمرۆی نەتەوەی کورد، زیدەیی بە سەر بەرژەوەندی حیزبایەتیدا هەیە.

پێویست ناکا بچمە نیو ئەم باسە، بەڵام ئەوەندەیە ئەزموونی لە بەر یەک هەڵتەکانی ولاتانی پێشووی سوسیالیستی، بۆیە دەبێ دەرسی لێ وەر بگرین. یەکێ لە هۆیەکانی ناوەکی لە بەر یەکچوونی سیستمی ئەو ولاتانە، حیزبایەتی و دەمار گیری حیزبی و یا بە قەولی ئولوف پالمە« دەسەلاتی حیزبی نوخبەگان» بوو. لەم ولاتانە کەسانی لێهاتوو، ولات پارێز، لێزان ئەگەر حیزبی نەبان دوور دەخرانەوە، خەڵکی درۆ زنی، بەرتیل خۆری زمانلوس و مەراییکەر، بەو شەرتەی کەولی حیزبیان دەبەر کرد با، کاریان پێ دەسپێرا و ئەخلاق و بەرژەوەندي نیشتمان و کەرامەتی ئینسانیان دە خستە ژێر پێ.

لەم کاتەدا کە خوارووی کوردستان پێویستی بە سیاسەتێکی تەواو خەڵکیی و سینگ فراوانی هەیە، ئەم شێوە حیزبایەتیە دەبێتە هۆی بەخشینی هێندێ ئیمتیاز و زێدەیی بێ جێ بە هێندێ کەسی نێو دەسەلات، کە لە گەڵ بەرژەوەندی گشتی نایەتەوە. دەبێتە هۆی پێشێل کردنی دێموکراسی و مافی خەڵک و ملهوری و لە خۆ بایی بوونی هێندێ کەس بێزاری و نارەزایی خەڵکی لێ ساز دەبێ.

## له خوارووی کوردستاندا، چی دەبینی؟

پرسیارێکی سادەو کورتە. بەلاّم هەر لەو کاتەشدا دژوار و وەلاّمدانەوەی هاسان نیە. لە خوارووی کوردستانی ئیمرۆدا، سەدان دیاردەی لێک جیاوازی جوان و ناحەز و شادیهێنەر و خەفەتاوی دێنە بەر چاو.

کۆمەڵێک خەڵکی بە شەرەف و فیدا کار دەبینی کە لە ژێر ناوی پێشمەرگەو لە ریزی لەشکری میللی کوردستاندا، چەکی شەرەف و پارێزگاری نیشتمانیمان لە شانی دایەو بە مەعاشێکی نەمر نەژی لە مەتەریزی شەرفدا ویستاون و پارێزگاری لەم ئاو وخاکە دەکەن.

خەڵکێکی تر دەبینی سەرەرای بێ دەرەتانی و نەبوونی کەرستەو ئامراز ملیان داوەتە بەر لە سەر وێرانکاریەکانی بەعس خەریکن کوردستان ئاوەدان بکەنەوە.

خەڵکێکی زۆر دە بینی وەک مار و مێروو شەو ورۆژ بۆ پەیدا کردنی پاروە نانێک لە جم و جۆڵ و تەقەلا دان.

جەماعەتێک دەبینی بە هێنانی شتومەکی پێویستی ژیانی رۆژانە بازاریان پر کردوە، بە لاّم لە بواری قیمەت دانان و فرۆشتنەوە گوێ نادەنە هەژاری و پەژارەی خەڵک و سود ئامانجی بنەرەتیانە. هە چۆنێک بێ کارو تێکۆشانی ئەوان بۆ بارودۆخی ئیمرۆی کوردستان هەنگاوێکی مێرانەیە.

جەماعەتێک دەبینی لە بارودۆخی کوردستان کەڵکی خەراب

وەردەگرن. خۆیان خزاندۆتە نێو ریزی حیزبەکانی دەسەلاتدارو ئامانج و مەبەست و تێکۆشانیان پارە پەیدا کردن و عەیبدار کردنی ئەزموون و دامەزراوەی تازەی کوردستانە. من خەبەرم دابوو دوو برادەرم لە ئێرانەوە بێن بیانبینم. لە قەلادزە دەچنە گومرگ و داوای وەرەقە دەکەن. نایاندەنێ و پێ‌یان دەلێن نابێ، رێگا نیە. پاشان یەکێک دەچێتە لایان و هەر یەکەی . . ۲ دیناریان لێ وەر دەگرێ و دەیان هێنێ تا رانیە و بەرێ‌یان دەکات. خۆ دوور نیە ئەگەرکەسێک پارەی زیاتر بدات، نەیانیەنە بەغداش. !!

نمونەی وا کەم نێن و رێگا چارەشیان فرە دژوار نیە .

کۆمەلی ماموستایانی قوتابخانە دەبینی کە کەم دەرامەتترین قشری کۆمەلن. بەلام چرای پەروەردەو فێرکردنیان بە دەستەوە گرتوە و نەیاهێشتوە بکوژێتەوەو مندالی کورد لە خوێندن بێ بەش بن. بەلام کەمتر ئاوریان وەسەر دەدرێ و لەو پەری دەست تەنگیدا دەژین.

کۆمەلی رووناکبیر و نووسەر وشاعیر و هونەرمەندان دەبینی لە بەر نەبوونی دەرەتانی نووسین و بلاو کردنەوە، نەبوونی یەکێتی راستەقینەی سینفی، نەبوونی یارمەتی بەم بەشەی کولتور و روشنبیری، دەستەوستان وبێکار داماون و رێگای تێکۆشانی روشنبیری‌یان لێ گیراوە.

- جوتیار و وەرزێرانی کوردستان دەبینی کە دوای وێرانکردنی گوندەکان و راگواستنیان بە دەستی حکومەتی بەعس، لە سایەی راپەرینی خەلک و دەسەلاتی نەتەوەیی، چوونەوە سەر زەوی و زاری خۆیان و بەلام ئەو جار

لە گەل کۆنە دەرەبەگ و قولە عەشیرەتان پێوە بوون و چاوەروانن

که حکومەتی هەرێم پێیان رابگات.

دەرمانخانەی شارەکان دەبینی کە خەڵک لە بەر دەرگایان بە کۆمەڵ وێستاوەو بەڵام دەرمانیان تێدا گیر ناکەوێ.

- لە وانەدا خدارتر، ئاوارەو دەر بەدەری کەرکوک و گەرمیان دەبینی کە پتر لە هەموو دەستەو تاقمی کۆمەڵ رەزیل بوون و بەرەو فەوتان دەرۆن. لە سەر زێد و جێگاو رێگای خۆیان هەڵکەنراون و لە بەشی ئازاد کراویش بێ بەش لە گشت بژیوێنکی ژیان رۆژ دەبەنە سەر.

- ژن و منداڵ و خاو وخێزاني ئەنفالکراوەکان و شەهیدانی رێگای رەزگاری دەبینی کە زۆر کەم ئاوریان وەسەر دەدرێ و زۆر کەم یارمەتیان پێدەکرێ. هێندێ فیلمی ڤیدیۆیی و وتاری تۆمار کراو کە دەگەنە ئوروپا، ئەم واقعیەتە داخدارە بە جوانی نیشان دەدەن. لە کاتێکا گەلێک جار لە رۆژنامەکاندا باسی ناردنی گومەگ و یارمەتی لە لایەن رێکخراوە خێر خوازەکانەوە بۆ ئەنفالکراو ولێقەوماوەکانی خوارووی کوردستان دەخوێنینەوە.

لەم بارەوە خۆم ناتوانم هیچ بێژم. لێرو لەوێ فرە قسەدەکرێ. لە کۆمەڵی کوردەواریدا هێندێ جار کێچ بە گا دەفرۆشرێ. باشترە لەم بوارەدا سەیرێکی ئەم نووسراوە بکەین کە لە لاپەرەی ۸ی ژمارە ۱۸/۱۱/۱۹۹۳رۆژنامەی برایەتی ئورگانی پارتی دیموکراتی کوردستان - یەکگرتوو دا چاپکراوە:

# یارمەتیەکانی ڕێکخراوە خێر خوازەکان چییان لێ دێت ؟!!

دوای ئەو برسیەتی و گرانیەی گەلەکەمان لە سایەی دوو ئابلوقەوە توشی هاتوە، یارمەتیەکانی ڕێکخراوە خێر خوازەکان تاقە تورسکەی هیواو هومێد بوون بۆ گەلەکەمان لە برسیەتي و مەرگی سامناکی لە سەرە خو رزگاریان بکات. بەلام بە داخەوە ئەوە بوە دوو سال و چەند مانگێک دەچیت ریژەیەکی زور کەمی خەلکی کوردستان نەبیت ئەگینا ئەوی تر چاوی بە تۆزقالیکی ئەو یارمەتیانە نەکەوتوە. بویە خەلکێکی زور لەو ریکخراوانە بی ئومید بووتە.

لە راستیدا ئەو ریکخراوانە بە گویرەی توانای خویان دریغیان نەکردوە لە کو کردنەوەو هەناردنی یارمەتی پێویست بۆ کوردستان، بەلام ئەوەی جێگای داخە هێندیک لەو ریکخراوانە لە لایەن ژمارەیەک کەسانی هەلپرست و پارە کو کەرەوە لە کوردستاندا دەستیان بەسەر داگیراوە کە هیندێکیان لە لایەن حیزیەکانەوە پشتگیری دەکرین و هیندیکیشیان لەو کوردانەن کە چەندین سالە لە دەرەوەن ئەمرو بە ناوي زمانزانی یان شارەزایی ناوچەکە یان هەر شتێکی تر دەستیان بە سەردا گرتوە و بە خۆیان سەر پەرشتی دابەشکردنی یارمەتیەکان دەکەن. بەلام بە داخەوە ئەمانەش لە جیاتی ئەوەی بە دەست پاکی و بە ویژدانەوە بە هانای گەلەکەیان بین و بە عەدالەت ئەو یارمەتیانە دابەش بکەن وەکو ئەوەی لە غەزادا مالی کافریان کەوتبێتە بەر دەست ریژەیەکی کەم نەبیٚ کە دابەشی دەکەن

ئەگینا ئەوەکەی تر هەمووی دەدزن و بە ریگای شەریکە دزەکانیان دەیهیننە بازاری رەش و بە نرخی روژ دەیفروشنەوە ئەو خەلکە لیقەوماوە. ئەوەی کە دابەشیشی دەکەن لە سنوورێکی زور تەسک دایە و لەو ناوچانەیە کە خزم و کەس و کاری خویانی لییە یا خود لایەنگیری حیزبەکەیانن. یا خود لە هیندی ناوچەی تر بو پرو پاگاندەو دروست کردنی بەلگە بو مەلبەندی ریکخراوەکە لە دەرەوە تا وەکو دلنییان بکەن کە دابەشیان کردوە.

شایانی باسە هیندیک لەو کوردانەی کە چەندین سالە لە ئورووپا و روژئاوان و نەیانتوانیوە مالیکی پچوک بو خویان پیک بهینن ئەمرو بە هوی دزینی ئەو یارمەتیانە نەک هەمرو شتیکیان تەواو کردوە لە مال و ژن و خانوو کارگەو دوکان...تاد بەلکو لە کوردستانیش خانو وزەوی و زاریان کریوە بو ئەو روژەی کە دەگەرینەوە کوردستان. هەندیک لە حیزبەکانیش ئەم یارمەتیانە بە کار دینن بو کرینی ئەم و ئەو. ئەمەیە وەزعی دابەشکردن لە کوردستاندا. بیگومان ئەم کارەش لە چەندین لاوە زیانی بو گەلەکەمان هەیە، لەلایەکەوە زیاتر خوینی گەلەکەمان دەمژن، لە لایەکی تریشەوە رووی گەلەکەمان لە لای رای گشتی جیهان ناشیرین دەکەن و بە دزی تیدەگەن. بیگومان ئەم کارەش خەیانەتیکی گەورەیە کە ئەم بە ناو کوردە دەروون نزمانە دەر حەق بە گەلەکەمان دەیکەن.»

نمونەی ئاوا لە نیو لاپەری هەمرو روژنامەکانی خوارووی کوردستاندا زور دەبینرین و بەلام بە قەولی فارسان: «گوش شنوا کمند» و کەس گوی ناداتی.

دیاردەیەکی دیکەی فرە ناحەز و دزیو کە دوای ئازادی لە

کوردستان سەری هەڵداوە رەشە کوژی یە. پێمان خۆش بێ یا ناخۆش ئەم کردەوە دزێوە ناپەسندە لە جیهانی دەرەوەو لە نێو کۆر و کۆمەڵە دیموکراتەکانی جیهان پەڵەی رەش دە خاتە سەر ئەزمونی تازەی کوردستان و رەوتی دێموکراسی و داوێنی حکومەتی هەریم. کورد لە تەواوی ماوەی خەباتی خوێناوی و فیداکاریدا، تەنانەت دژی دوژمنانی خوێن رێژیش دەستی لە رەشەکوژی پاراستوە . ئەم خۆ پاراستنە لە کردەوەی تروریستی بۆتە هۆی پەسن و دەنگدانەوەی خەبات و تێکۆشانی رەسەنی بروتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە جیهاندا. بەلاْم ئێستا لە کوردستانی ئازاد کە پارلمان و حکومەتی کوردی دامەزراون و دەسەلاْتیان بە دەستە، رەشە کوژی بۆتە باو و هیچ جنایەتکارێکیش نەگیراوەو سزا نەدراوە. خۆ ناکرێ ئەم جنایەت و رەشەکوژیانەی لە ماوەی دەسەلاْتی حکومەت دا کراون بە دوژمنایەتی شەخسی و تەماعی پوڵ و پارە دابنرێن، چونکە هەموویان شەقڵی سیاسیان پێوە دیارە. لەم بوارەدا حکومەتی هەریم ئەرکێکی قورسی لەسەر شانە و هەق نیە رێگا بدات بەم کردەوە دزێوانە هەم دێموکراسی و مافی مرۆڤ پێشێل بکرێ و هەم کار بکاتە سەر پرستیژ و ناوبانگی ئەزمونی تازە و دەسەلاْتی نەتەوەیی لە کوردستانی خوارەوو. لە بیرمان نەچێ لە تەواوی ماوەی دامەزرانی کۆمەڵەی ژ.ک و حیزبی دێموکرات و دەسەلاْتی کۆماری کوردستان پێش ٤٧ ساڵ تاقە یەک تیروری سیاسی کرا. ئەوێش کوردستان و کۆمەڵی کوردەواری بوو .!!

حکومەتی کوردستان و حیزبە دەسەلاْت دارەکان ئەگەر بیانەوێ دەتوانن تا رادەیەکی زۆر چاری ئەو مەسەلانە بکەن و دەستی دزو پیاو خەراپان کورت کەنەوە .

# گیرو گرفتی سەرەکی
# مەسەلەی خوارووی کوردستان

ئەگەر هەروا بە رەمەکی و بیٚ شارەزایی لە گەمە و پلانەکانی پشتی پەردە بروانینە رووداوەکان و بمانەویٚ وەک
دلسۆزیکی ئەم نیشتمان و ئەم ئەزموونە تازەیە لیکیان دەینەوە، دە گەینە ئەم بیرو رایە کە دوو خالی سەرەکی تا رادەیەکی زۆر بارو دۆخی خوارووی کوردستان و ئەزموونی تازەی بزووتنەوەی کوردیان خستۆتە مەترسیەوە:

یەکەم -- هەلویستی غەیرە مەسئولانەی دەولەتی ئەمریکا و حکومەتانی ئوروپایی کە مەسەلەیەکی ئاوا گرنگیان خستۆتە پشت گویٚ و بە پیچەوانەی ئاخافتن و راگەیاندنیان لە مەر ( مافی مرۆڤ و چاوەدیری دیموکراسی) بۆ چارە سەر کردنی یەکجاری تەنگ و چەلەمەی خوارووی کوردستان هەنگاو هەلناهینن.

ئەم خۆگیل کردن و ساوە ساوە، بۆتە هۆی ئەوە کە دوژمنانی گەلی کورد لە عیراق و لە دەرەوەی کوردستانیش رۆژ بە رۆژ پتر پیلان و ئاژاوە بنینەوەو بیانەویٚ بە بیانووی جۆر بە جۆر دەست بخەنە نیو کارو باری حکومەتی هەرم و بنکۆلی بکەن و تووشی سەر یەشەی بکەن. لە بیرمان نەچۆتەوە لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی سیٚ ولاتی تورکیاو ئیران و سوریا سالی رابردوو بە ئاشکرا دژایەتی خۆیان لە گەلٚ پیک هاتنی پارلمان و حکومەتی هەریمی کوردستان راگەیاند و

دەیانگوت: « پارلمانی کوردی ناتوانیٚ مەلْبەندی کوردستان ئیدارە بکات» ئاغای عەلی ئەکبەری ویلایەتی وەزیری دەرەوەی کوماری ئیسلامی ئێران رایگەیاند:« ئاژاوەو گێرە شێوێنی کوردستان کار دەکاتە سەر ئاسایشی نێو خۆی ئەو سیٚ ولاٚتەی تورکیاو ئێران و سوریا. »

تێپەر بوونی نیزیکەی سیٚ سالْ بە سەر پارلمان و ئەزمونی نوێی خوارووی کوردستان، پێچەوانەی ئیدیعای وەزیرانی ئەم سیٚ ولاٚتە نیشانداوە. بەلاٚم حکومەتەکانی تورکیاو ئێرانن کە رۆژێک لە ئاژاوە نانەوە و یا خۆ دەست درێژی ئاشکراو بیٚ شەرمانە بۆ سەر خوارووی کوردستان نەویستاون. ئەم شەر و ئاژاوەی لەم دواییەدا لە کوردستان بە ناوی نا ئیسلامی ساز کرا، راست بەرهەمی ئەم نەخشەو پلاٚنە بوو کە پتر لە سالێک لە جانتای دیپلوماسی ئاغای عەلی ئەکبەری ویلایەتی دا رێک و پێک دەکرا و چاوەراون بوو لە هەلێکدا بیخاتە کایەوە. دەیانویست لەم رێگایەوە ئاسایش و ئەمنیەتی کوردستان تێک بدەن و رێگا بۆ دەست درێژی خۆش بکەن. ئەگینا ئەوە گەلی کورد ..١٤ سالە بە شەق موسولمان کراوە و خولاٚ هەلْناگریٚ لە هەموو گەلانی دراوسیٚش پتر بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام ملی راکێشاوە. جا ئیتر چ پێویست دەکا تازە حکومەتی ئێران بۆ سەپاندنی (ئیسلامی خۆ ئاسایی) ئارپیچی و تۆپ و خومپارە لە کوردستان عەمبار بکات و جۆگەی خوێن هەلْبەستیٚ. ؟

ئەمە لە بواری سیاسیەوە، بەلاٚم دەوەلْەتەکانی( پارێزەری مافی مرۆڤ) و کۆمەلْی دەولْەتە (نەک نەتەوە ) یەکگرتوەکان لە باری ئابوری و بژیو و یارمەتی ئینسانیشەوە، ئەرکی ئینسانی خۆیان لە

ئاست کورد بە جێ ناگەیەنن. ئێستا گەلێک کانگا و فابریک و بنیاتی پیشە سازی کوردستان ویستاون و هەزاران کرێکارو زەحمەتکێشی کورد بێکارو دەستەوەستان دەسوورێنەوە، بەڵام ئەوان ژیانی خەڵکی هەژاری کوردیان خستۆتە پشت گوێ و بۆ وەکار خستنی بنیاتە سەنعەتیەکانی کوردستان و وەگەر خستنی چەرخی ئابووری و ژیانی خەڵک هەنگاوێک ناوێژن.

دووەم - پێوەندی بە هەڵوێستی حیزبەدەسەڵاتدارەکان و بە کارو باری حکومەتی هەرێمەوە هەیە. خۆ ناکرێ چاوە روان بێن کە لە بارو دوخی جوت ئابلوقەی ئابوری و لە وڵاتی وێرانکراوی بەعس لێدراو و تالانکراو، هەموو شت رێک و پێک و لە جێی خۆی بێت. بەڵام دەکرێ هەر لەم باردوخە ناهەموارە ئابوریەشدا تەنگ و چەڵەمەکانی کۆمەڵ تا رادەیەک چارە سەر بکرێن. تا رادەیەک یارمەتی زیاتر بە ژیانی دژواری موستەهەقەکان بکرێ. دەکرێ دەستی دز و کڵاو چی و هەلپەرستان کورت بکرێتەوە. دەکرێ لە بواری دابەشکردنی ئەرزاق و شتو مەکی پێویستی ژیان، بە تایبەت یارمەتی بە ئاوارەکانی کەرکوک و ژن و منداڵی ئەنفال کراوەکان و خانە نشین و ماموستاکان، هەنگاوی جیددی باوێژرێ. بە کورتی ئەگەر دوو حیزبی دەسەڵاتدار و حکومەت بیانەوێ ،دەکرێ ناتەواویەکان تا رادەیەکی زۆر چارە سەر بکەن.

یەکێ لە هۆیەکانی سەرەکی ئەم کەم و کوریانەی کە هەموو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزی توشی نیگەرانی کردوە، سیستمی دوو حکومەتی و مەسەلەی «فیفتی - فیفتی» پەنجا بە پەنجا و ململانی دوو حیزبی سەرەکیە کە وەها کاری کردۆتە سەر رەوتی ئەزمونی

تازەو رووداوەکانی کوردستان، لە هەموو بە شەکانی سیاسی و نیزامی و ئابووری و کۆمەلایەتی و روشنبیری و راگەیاندن و کار و باری پارلمان و حکومەت دا، بە شکلی مەتفی خۆ دەنوینیٚ. ئەم مونافەسە و ئەم شێوە رێبەرایەتیە کەس نە دیتوە، جگە لەوە کە دەبێتە هۆی نارەزایی کۆمەلانی خەلکی دلسوز و فیداکار، بێگومان کار دەکاتە سەر سیاسەتی حکومەتی هەرێمیش لە مەیدانی جیهانیدا. رێگای چارە سەر کردنی بار و دوخی گرژی ئێستا، بە بروای من ئەوەیە بەر لە هەموو شت کۆتایی هینانە بە سیستمی دوو حکومەتی و نە هێشتنی ململانەی حیزبایەتی. باشترین رێگاش بۆ ئەم کارە بریتی‌یە لە

- زیندوو کردنەوەی بەرەی کوردستانی و پێکهێنانی حکومەتێکی هاوگر لە هەموو هێزەکان و لە کەسانی نیشتمانپەروەری سەر بەخۆی لێهاتوو، تا هەلبژاردنی پارلمانی تازە.

- هەلبژاردنی ئەنجومەنی شار و ناوچەو گەرەک و یەکێتی‌یە کانی پیشەیی و ئەسپاردنی کاروباری خەلک بەو ئەنجومەن و یەکێتیانە و چاوە دیری حکومەت بە سەر کارو تێکۆشانیاندا.

- پاک کردنەوەی ریزەکانی حیزب و حکومەت و ئیدارەکانی حکومەتی لە کەسانی گومان لێکراو و هاوکاری رابردووی بەعس و دز و دەست پیس.

- یارمەتی بە ئاوارەکانی کەرکوک و ئەنفالکراوەکان و خاو وخێزانی شەهیدان. ئەوەش لە رێگای کومیتەی تایبەتی غەیرە حیزبی و هەلبژێر دراوی خەلک.

وادیارە نووسینەکەم لە چوار چێوەی ( سەفەر نامە ) دەر چوە و پتر لە بەرەی خۆی قاچی راکێشاوە. کورد ئەوەندەی نەکسەو شکست

و نەهاتی و ماڵویرانی بە سەر هاتوە، ئیستا کە ئەوەندە رووناکاییە شک دەبات ، لە ترسی ئەوەی نەوەکوو بکوژێتەوە و جارێکی دیکەش تووشی کارەسات بینەوە و بە نووسین و شیعر و پەخشان و چیرۆک یادی بکەینەوە، هەر کەس بۆ مانەوەو پاراستن و پتەو بوون و پەرە پێدانی، هەر چی بە سەر هۆش و زمان و بیر و قەڵەمی دا دێ دەینووسێ و دەری دەبرێ. هەمووشی دڵسۆزی‌یە و لە ترسی کوژانەوەی ئەو چۆلە چرایەیە.

لە مێژووی خەباتی خویناوی نەتەوەکەماندا، بۆ هەوەڵجار هەل و مەرجێکی لە بار هاتۆتە پێش. ئەگەر بە ژیری و لێزانی کەلکی لێ وەر بگیرێ، ئەگەر هەموو هەوڵ و تێکۆشانێک بە دڵسۆزی، دوور لە ململانی حیزبایەتی و ئارەزووی شەخسی، بۆ پاراستنی دەسکەوتی نەتەوەیی و بەرژەوەندی گشتی مەسەلەی کورد بێتە کایەو بە کار بهێنرێ، بێگومان ئەو میللەتەی کاروانی خەباتی رزگاریخوازی گەیاندۆتە ئەم قۆناخە، لە توانای دا هەیە بەرەو سەرکەوتن و رزگاری یەکجاری بۆ پێشەوەی بەرێ و بیگەیێنێتە دوا قۆناخی حەسانەوەو بەختەوەری.

من رەشبین نیم. چونکە هەستم بەوە کردوە کە هەرتک رێبەری حیزبە سەرەکیەکان پتر لەوەی من باسم کردوە ، هەست بە کەم و کوری و ناتەواوی و پێشێلکردنی ماف و یاسا و مەترسی دەکەن. مانای وایە بۆ چارە سەر کردنیشی هەوڵ دەدەن. ئەمە خۆی نوختەیەکی گرنگە و هیوادارم گەشبینیەکەم بە خۆرایی نەبێ.

بە دوو پاتە کردنەوەی وتەی زانایەکی فەلسەفی سەفەر نامەکەم کۆتایی پێدێنم :

« وتەی راست و بابەتی ( واقیعی ) جوان نین»
« وتەی جوانیش راست و بابەتی (واقیعی) نین»
رێبەنداتی ١٩٩٤ ستوکهولم .

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:

١ - کاروانێک لە شەهیدەکانی کوردستانی ئێران
٢ - وەڵامێک - کوردی و فارسی
٣ - ڕێنوێنی شەڕی پارتیزانی
٤ - لەدەوری ڕێکخراوی لاوانی حیزبی دێموکرات کۆ بینەوە
٥ - ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی کتێبی حوسێنی مەدەنی
٦ - چەند قسەیەک لەگەڵ خەبات
٧ - کورد و فەرهەنگی بێگانە
٨ - لێکۆڵینەوەی «کورتە باسێک لەسەر سوسیالیزم» کوردی و فارسی.
٩ - تایبەتی کۆنگرەی شەشەم
١٠ - کۆماری دێموکراتی کوردستان یا خود موختاری
١١ - یادی هێمن
١٢ - لە پێناو چیدا ؟
١٣ - یادانەوە
١٤ - لە بیرەوەریەکانم - بەرگی :١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨،
١٥ - سەفەری کوردستانی ئازاد

## چاپکراوی وەرگێڕاوەکان

١ - دایک - ماکسیم گورکی
٢ - ژیان و کردەوەکانی لینین
٣ - ئەفسانە کوردی یەکان - ڕۆدینکۆ

٤ زەوی پچوک
٥ مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید
٦ - رەوشی کوردان - میژووی ئەردەلان و بابان

## چاپ نەکراوەکان :

١ - کۆمەلە چیرزکی هەلبژاردە لە ئەدەبی بێگانە
٢ - یاسای بنچینەیی ئابووری سوسیالیستی
٣ - حەمە چکۆل ( ئینجە مەمەدی یاشار کەمال
٤ - ئوسولی سەرەتاییەکانی فەلسەفە - ژۆرژ پولستر
٥ - نامەی گوللە بارانکراوەکان
٦ - ئازادی یا مەرگ - کازانتزاکیس
٧ - کڕ و کاش



لەگەڵ بەڕێز هاوری عەزیز محەممەد، لە هەولێر (٩٣/١١/٢٧)



لەگەڵ کاک قادر عەزیز، سکرتێری حیزبی زەحمەتکێشان، لە هەولێر (٩٣/١٢/٢)

